# دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **داستانی دوو شار (١٧٩٣-١٧٥٧)**
- نووسینی: چارلز دیکنز
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزی بۆ کوردی: جەلال سەعید زادە
- کورتکراوەی: ئەی.جوهنسۆن و جی.سی.تۆڕنلی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: دلێر
- بەرگ: مەریوان زەندی
- ژمارەی سپاردن: ٩١٠
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- چاپی یەکەم ٢٠١٠
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٤٤٥)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# پێشەکی

چارلز دیکنز یەکێکە لە گەورەترین و بەناوبانگترین رۆماننووسەکانی ئینگلتەرایی کە لە ساڵی ١٨١٢ی.ز.دا لە بنەماڵەیەکی هەژار و دەستکورت لەدایکبووە.

ئەو پیاوە لە سەرەتادا هەواڵنێری رۆژنامەیەك بووە و پاشانیش کە بۆ یەکەمین جار دوو کتێبی لە ساڵەکانی ١٨٣٦ و ١٨٣٧دا بە چاپ گەیاند ناوبانگی باشی دەرکرد.

ئەو پیاوە گەورەیە پاش نووسینی چەند رۆمانێکیتر لە ساڵی ١٨٧٠دا کۆچی دوایی کرد.

دیکنز ژیر و رۆشنبیر و شارستانی بوو و شەقامەکانی لەندەنی لە هەموو جێگەیەکیتر زۆرتر خۆش ویستووە. ئەو پیاوێکی گەورە و خۆشڕوو و خۆشەویست بووە بە دایم وردبین بووە لە هەر جێگەیەکدا سەبارەت بە هەرجۆرە هەڵس و کەوتی خەڵك. هەر بۆیە لە بواری هونەری و ئەدەبیدا چاکترین و گەورەترین دەرهێنەریش بووە و توانیویەتی هەر جۆرە نەخش و رۆڵی هونەری وەك لاواز، مامناوەندی یاخود کلاسیك دەربهێنێت.

بە توانایەکی زۆر سەرسوڕ هێنەرەوە ئەیڕوانییە هەستی ناڕەسی هەر مرۆڤێك، هەر بۆیە لە زۆربەی رۆمانەکانیدا بارودۆخی ئاڵۆزی کۆمەڵەکەی خۆی دەهێنێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە و بە وێنەیان دەکێشێ و هەندێ جاریش بۆ کێشەکانی ناو کۆمەڵەکەی چارەسەر دەدوزێتەوە.

ئەمەش ((داستانی دووشار)) کە یەکێکە لەدوو هەوڵە سەرەتاییەکانی لەبواری رۆمان نووسینی مێژوییدا. کە ئەم چیرۆکە یەکەم جار لە ساڵی ١٨٥٩ی.ز.دا لە چاپدراوە کە باس لە داستانەکانی شۆڕشی ١٧٨٩ی.ز. لە فەرەنسەدا دەکات.

لەم چیرۆکەدا باس لەو رووداو و کارەساتانەی کە لە نێوان هەر دوو شاری لەندەن و پاریس روویانداوە دەکرێت و بەوێنە کێشراون کە کاتی روداوەکانیش لە نێوان ساڵەکانی ١٧٥٧ تا ١٧٩٣ی.ز یە.

# کەسایەتی

سایدنی کارتۆن: پارێزەری لەندەن. پیاوێکی بەتوانا و لەخۆ بردوو. هاوکاری مستر سرایڤر

راجێر کلای: جاسووسی بێلی پیر.

جێری کرانچێر: هەواڵدەری بانکی تێلسۆنەکان.

مانسیۆر ئێرنست دیفارج: دوکانداری شەرابفرۆش لە شەقامی ئانتۆینە ڕێبەری شۆڕشگێڕەکانی ئەو شەقامەیە.

مانسیۆر گابل: نوێنەری مارکۆس ا.س.ت ئیڤرموند.

گاسپرد: پیاوکوژ

جاکیۆس یەك، جاکیۆس دوو، جاکیۆس سێ: شۆڕشگێڕن.هاوکاری دیفارج دەکەن.

جاکیۆس چوار: ناوی نهێنی دیفارج.

جاکیۆس پێنج: هاوکاری دیفارج بوو. دروستکەرەوەی ڕێگە و بان بوو لەدواییدا بوو بە دارشکێن.

جارویس لۆری: فەرمانبەری بانکی تێلسۆنەکان کە دۆستی بنەماڵەی مانێیت بوو.

دکتۆر مانێت: دکتۆری پاریس بوو ماوەی چەند ساڵ زیندان بوو لە بەندیخانەی باستیل.

سۆلومۆن پروس: ئەو لە هەندێ شوێنیتردا بە جان بارساد ناسرابوو جاسووس و هەواڵدەری نهێنی بوو. برای خاتوو پروس بوو.

مارکۆس إس.تی.ئێڤرمۆند: ئەشرافی بە ناو بانگ عەشیرەت دار و دەوڵەمەند مامەی چارلز إس.تی. ئێڤرمۆند.

چارلز إس.تی. ئێڤرموند: لێقەوماوی فەڕەنسی کە ناسرا بوو بە چارلز دارنی.

مستر سترایڤر: پارێزەر لە دادگای لەندەن.

مادام دیفارج: ژنی مانسیۆر دیفارج. ڕێبەری ژنە شۆڕشگێڕەکانی شەقامی ئانتۆینە.

لویس مانێت: کچی دکتۆر مانێت.

لویس إس.تی ئیڤرموند: کچی پارێزەر ئیڤرمۆند.

ڤینگینس واتە ((تۆڵەسێن)) :ڕێبەرێکی ئافرەت بوو لەنێو ژنەشۆڕشگێڕەکانیشەقامی ئانتوێنە.

- ١ -

# دوکانەکەی مانسیۆر دیفارج

شـــەقامی ئانتۆینـــە یەکێکـــە لـــە هەژارنـــشینترین بەشـــەکانی پـــاریس. لـــەوێ منداڵەکانیش وەك پیاوەپیرەکان دەنگیان گڕ و رەنگیان گۆڕابوو. گومان دەکرا بە سەر ناوچاوانی هەموویانەوە بە پیاو و ژنەوە برسیەتی نەخشی خۆی نواندبوو.

قەسابخانە و گۆشتفرۆشەکان جگە لە هەندێ پێشە و پەڵانیبۆگەن کراو هیچی تێدا دەست نەدەکەوت. هیچ دوکانێك بریقەی نەئەدایەوە جگە لەو دوکانانەی کە تفەنگ و شت و مەکی شەڕی تێدا دەفرۆشرا کە بریتی بوون لە تیژترین چەقۆ بریـسکەدارەکان و زۆربـەی جـۆری تفەنگـە مـەرگ هێنـەرەکان کـە ئەبوایـە رۆژێ بـە مەبەسـتی بـە ئەنجامگەیاندنی کارەساتێکی دڵتەزێن کەڵکیان لێ وەربگیرایە.

لەوێ لە شەقامی ئانتۆینەدا بەرمیلێکی گەورەی شەڕاب لە بار داکەوتبوو شکابوو. شەڕابی سوور دەستیکرد بـە جـوولان بـەرەو درز و قوژبنـەکان و لـەنێـوان قولۆوتـەکان و درزەکان جێگەی خۆی کردەوە و لە بازێ شوێن گۆماڵاوکەی بچووکی دروستکرد.

لەو دەور و بەرەدا لە دوور و نزیکەوە لێرە و لـەوێ و لـە هـەموو شـوێنێکەوە بـە پەلە و بێ دوا کەوتن خەڵکەکە دابـارین بـە سـەریدا و هـەر یەکـە بـە گـوێرەی خـۆی کارەکانی خۆیان وەستاند و هاتن بۆ بەربەست کردنی شەراب کە پێش ئـەوەی لـە نـاو درزەکاندا نوقم بێت کەڵکی لێوەرگرن. بۆیەش بـازێ کـەس چـۆکی دەنایـە زەوی و بـۆ خۆی قولەمشتی لێپڕ دەکرد کە بیفڕێنێ. یان هەنـدێ کەسـیش بینیـان پێـوە دەنـا و هەڵیان دەقوڕاند. ئەوانیتریش بە پەرداخ و جام دەهاتن بۆفڕاندنی تۆزێ شەراب.

لەوێ لە شەقامی هەژاری و ماتەمیدا دەنگی خەندە و شـادی و پێکـەنین دەهـات بەڵام کە بە خێرایی شەراب برا و بڕایەوە ئیتر خەندە مرد خەڵکی هەژار و برسـی هـەر یەکەو گەڕایەوە بۆ سەر ئیش و کاری خۆی.

پیاوێکی باڵابەرز و کەڵەگـەت پەنجـەکـانی خـۆی لـە قـوڕاوی سـەرووی شـەڕابەکە

هەڵژەند و بە دیوارێکەوە پێنج پیتی گەورەی نووسی BLOOD (خوێن).

کاتی ئەمەش هاتبوو کە خوێن بە یەکجار شەقامی ئانتۆینە بگرێتەوە و هەر هەموو ناو شەقامەکە سوور بکات. لە سووچێکەوە بەرمیلە شرەی شەرابەکە بەرەو دوکانی شەرابفرۆشەکە دەبرا. لە بەردەرگای دوکانەکەدا مانسیۆر دیفارج کە خاوەن دوکانەکە بوو راوەستا بوو. پیاوێکی زۆر سەرنجراکێش بوو لە تەمەنی سی ساڵیدا سەری تاس بوو بەڵام بە رواڵەت باش بوو وا دیار بوو کە پیاوێکی زۆر بە توانا و وریا بوو ئامادە و زرت و زینو بوو وەك کەڵەپیاوێك کە دوژمن سڵی لێبکات. حازر بوو بۆ هەر چەشنە بزووتنەوەیەك.

مانسیۆر دیفارج بۆ ساتێ راوەستا و مشت و مڕی خەڵکەکەی بوو بەدەستهێنانی گوێلێ شەراب سەیر کرد. بە خۆی وت: ((کوڕە دەمن حەقم چییە؟! بەرمیلێکم شکاوە دڵنیام بەرمیلێ‌ترم بۆ دەهێنن!)).

سەیری پیاوە باڵابەرزەکەی کرد کە خەریکی نووسینی ئەو چەند پیتە سام هێنەرانە بوو بە دیوارەکەوە. بانگی لێکرد: ((پێم بڵێ گاسپێرد ئەوە تۆشێتی؟! ئاخر بۆ لە ناو شەقامێکی گشتیدا شتی وا دەنووسی؟! بۆچی شوێنی‌تر نییە لێرە باش‌تر بێت و شتێ لەو بابەتەی تێدا بنوسی؟!)).

مادام دیفارج لە ناو دوکانەکەدا دانیشتبوو کە لە هەمان کاتدا مێردەکەی گەڕاوە ژوورەوە. ئەو ئافرەتێك بوو هەر لە تەمەنی خۆیدا. دیفارج بەجووتێ چاوی گەش و زۆر جوان و دڵرفێنەوە رووسوور و داوێن پاك و خۆش ئەخلاق بوو گەردنی بەرز و دەم و چاوی پان بوو.

لەم کاتەدا کە مێردەکەی دەهاتە ژوورەوە بە سووچێکی چاو تێی روانی و ئیشارەتی لێکرد کە بۆ شوێنێکیتر بڕوانێ وەك لەو شوێنەوە چەند کەسێ خۆیان دەکرد بە ژووردا بۆ ناو دوکانەکە.

خاوەنی مەیخانەکە مانسیۆر دیفارج چاوێکی گێڕا بە ناو دوکانەکەیدا چاوی بە ئەفەندییەکی پیر کەوت کە ئافرەتێکی جوان و کەم تەمەنی لەگەڵدا بوو کە لە سووچێکەوە لە سەر کورسییەکان جێگەیان گرتبوو.

ناو دوکانەکە خەڵکی تری زۆر لێبوو بەڵام تەنها ئەم دوانە لاوەکی بوون. کاتێك دیفارج بە پاڵیانا تێپەڕی کرد، هەستیکرد بەوەی کەپیاوە پیرەکە سەرنجی هاوڕێ جوانەکەی بۆ لای ئەو رادەکێشا کە پێی بڵێ ((ئەمەش لە خۆمانە)).

دیفارج لە بەر خۆیەوە وتی: ((ئەمانە لە سەر زەویدا چ دەکەن)).

((من نایانناسم)).

دیفارج وای بە باشتر زانی کە چیتر سەیری ئەو دوانە نەکات و لەگەڵ سێ پیاویتر کە خەریکی خواردنەوە بوون دەستی کرد بە وت و وێژ.

یەکێکیان بەمانسیۆر دیفارج وتی: ((ئەوە چ روویداوە جاکیۆس؟ ئەوە ئەزانی بەرمیلە شکاوەکە هەر هەمووی نۆش کرا؟)).

دیفارج وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ هەر هەموو دڵۆپێکی جاکیۆس!)).

پیاوێکی تریان وتی: ((شتێکی ئاساییە کە ئەم حەیوانە چارەرەشانە وەك چاوبرسی چەشتی شەراب بووبن دەبا هەر لە برسانا بمرن. وانییە جاکیۆس؟)).

مانسیۆر دیفارج وتی: ((وایە جاکیۆس)).

پیاوی سێیەم پیاڵەی شەرابەکەی دانا. ((ئا! وەك چوارپێیەکی لاواز دایم مەزەی تاڵی لە دەمیان دایە. ژیانی سەختیان لە پێشە. راستە مانسیۆر دیفارج؟)).

مانسیۆر وەڵامی دایەوە: ((وایە تۆ راست دەکەیت جاکیۆس)).

ئیشارتێکی مادام دیفارج سەرنجی ئەوی راکێشا. وتی: ((سەروەران ئەو هۆدە کە ئێوە دەتانویست لە سەرەوەی پلەکانە. بڕۆن بۆ حەوشە خاڵییەکە یەکێکتان کە پێشتر لێرە بووە، ئەو شارەزایە و رێگەکەتان نیشانئەدات.

پارەی شەرابەکەیان داو لێیاندا رۆیشتن. ئەوەیان کە لە مانسیۆر دیفارج گەورەتربوو، نێزیکتر بووەوە و روخسەتی وەرگرت لەگەڵیا وت و وێژ بکات. وت و وێژەکەیان کورت بوو. لە یەکەم کاتدا لە دەم و چاوی (مانسیۆر دیفارج)دا شتێك دەرکەوت و خێرا ماق بوو. پاش یەك چرکە مانسیۆر دیفارج سەری راوەشاند و چووە دەرەوە.

پاشان پیاوەکە ئیشارەتی لە ئافرەتە جوانەکە کرد و پێکەوە ئەوانیش چونە

دەروە. مادام بێ ئەوەی هیچ سەرنجی دەوری خۆی بدات بەردەوام مایەوە لە سەر رستنی دروومانەکەی خۆی. لە حەوشەکەی پشتەوەدا مستر جارویس لۆری (پیاوە گەورەترەکە) لەگەڵ خاتوو لویس مانێت و (مانسیۆر دیفارج)دا یەکیان گرتەوە کە پێشتریش بۆ ئەو مەبەستە پێکهاتبوونەوە. لەو حەوشەیەدا دیفارج کارێکی سەرسوڕمێنی کرد چۆکی دا دا دەستی راستی خاتوونە شاجوانەکەی ماچکرد. دیفارج پێشتر نۆکەری دکتۆر مانێت باوکی لویس مانێت بوو. دایکی لویس مرد و باوکی بزر بوو. هیچ کەس نازانێ چۆن و چی بە سەر هات پارە و نەختینەکانی لە بەنکی تێلسۆنەکاندا بوو کە بەنکێکی بەریتانی بوو. لویسی منداڵیان هێنا بۆ ئینگلتەرا. خاتوو جارویس لۆری کە یەکێك بوو لە کارمەندە رەسمییەکانی بەنکی تێلسۆنەکان و هەروەها دۆستێکی دێرینی باوکی بوو. پارەکەی باوکی هێنایە گەڕ بۆ سەرف کردنی لە بواری زانستی و گەشە پێدان و بەخێوکردنی لویس مانێت. مستر لۆری داوای لە ئافرەتێکی ئینگلتەرایی کرد (مسس پروس) بۆ ئەوەی منداڵەکە(لویس مانێت) بباتە لای خۆی و بەخێویبکات. مستر پروس وەك دایکێکی چاك بە ئومێد و خۆشەویستییەوە بۆ کاتی منداڵی ژیانی بەو منداڵە بەخشی.

ئێستا لویس گەورەکچێکی جوانە. خەبەرێکی ناکاو بۆتە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ مستر (لۆری)دا بێت بۆ پاریس. هەواڵی دکتۆر مانێت (باوکی لویس مانێت کە وترابوو مردووە) ئێستا دەڵێن زیندووە. لە زیندانە گەورەکەی پاریس (زیندانی باستیل) زیندان بوو و بەم زووانە ئازاد کراوە، لە لای خزمەتکارێکی کۆنی خۆی دایە (دیفارج) وە ئەو خزمەتی دەکات. دیفارج هەستایە سەرپێ رەنگی گوڕا. هێشتا بۆنی چاکە کردن و پیاوەتی لێدەهات . هەر لەوێدا رق و تووڕەیی خوی نواند بەرامبەر بەوانەی کە خراپەیان بەرامبەر کردووە.

دیفارج وتی: ((پلەکان بەرزن با لەسەرخۆ بچینە سەرەوە)).

مستر لۆری بە چپە وتی: ((ئەوە ئێستا دوکتۆر مانێت بە تەنیا خۆیەتی؟)).

((هەڵبەت کە وایە. چونکە ئەو بۆ خۆی عادەتی گرتووە کە بۆ ماوەیەکی درێژ بە تەنیا بمێنێتەوە. جا ئەو کەی تاقەتی کەسی ماوە)).

((باشە زۆر گۆڕاوە؟)).

((گۆڕاوە! هەر نایناسیتەوە)).

هەر کە گەیشتنە سەرەوەی ئەو قاتە، دیفارج لە ناو گیرفانەکەیدا کلیلەکەی دەرهێنا.

((دەرگاکەت لێ داخستووە؟)).

((لام وایە کە داخراو بێت پارێزراوترە)).

((بۆ؟)).

((چون بۆ؟ چونکە ئەو ماوەیەکی درێژ دەرگا لە سەر داخراوە و ژیاوە بۆیەش دەبێ لە دەرگا لێکراوەیی بترسێ)).

مستر لۆری قیڕانی: ((بۆ شتی واش هەیە؟)).

دیفارج وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ شتی واش بووە. لەم دنیا جوانەدا هەر ئەبێت و نەك تەنانەت روو ئەدات بەڵکو هەموو رۆژێ روئەداتەوە. هەر وەك ئەمەی کە ئێستا لە فەڕەنسا روو ئەدات)).

ئەم وت و وێژانە هەر هەمووی بە چپەوە دەکران کە ئافرەتە جوانەکە یەك وشەی تێنەئەگەیشت. بەڵام کاتێ گەیشتنە سەری سەرەوە ئەمجارە ئەویش بۆ خۆی هەستی پێکرد. دەم و چاوی ماق بوون و کەوتە پەرۆشییەوە. وەك ترس چووە دڵی کە مستر لۆری قسەی بۆ کرد ئەوەندەی تر ورەی لەدەستدا.

((ورەت بەرز بێت. خۆشەویستم! بەخێرەت بە! تا ساتێکی تر هەموو نەهاتەکان کۆتایی دێت. ئێستا خۆشحاڵ بە تەنها لەو شادییە بیر بکەرەوە کە تۆ خۆت بەدیاری بۆ ئەوی دەهێنی((. سەرەنجام گەیشتنە سەرەوە. کە دەهاتنە سەر لەناکاو سێ پیاویان دیت کە لەدرزی دەرگاکەوە سەیری ناو ژوورەکەیان دەکرد. لەگەڵ چرپەی پێی ئەمانیان بیست خێرا هەستانە سەر پێ و دەرباز بوون. ئەو پیاوانە هەر ئەو سیانە بوون کە لە مەیخانەکەدا خەریکی خواردنەوە بوون.

دیفارج وتی: ((بڕۆن کوڕی باش وازمان لێ بێنن ئێمە لێرە کار و کاسبیمان هەیە)).

هەر سێکیان خێرا رایانکردە خوارەوە.

مستر لۆری تورە بوو! بە چپە وتی بە دیفارج ((ئەکرێ چاوپێکەوتنمان ببێت لەگەڵ مانسیۆر مانێتدا؟)).

((من ئەو نیشانی چەند کەسێ ئەدەم، ئەو کەسانەی کە لەوانەیە نیاز و مەبەستیان باش بێت. هەموویان وەك خۆم ناویان جاکیۆس بێت. تۆ ئینگلتەراییت، تێناگەیت داوات لێدەکەم بۆ یەك دەقە لێرەدا بمێنەرەوە)).

دیفارج بە کلیلی دەرگای هۆدەکە دەستیکرد بە خرەخر وەك مەبەستی ئاگادار کردنەوەی کەسێك بێت کە لەو دیو دەرگاکەوە لە ژوورەوەیە. پاشان کلیلەکەی لە نێو دەرگاکەدا جێگیر کرد و هێدی هێدی کێلۆنەکەی ترازاند. دەرگا کرایەوە سەیری ناو هۆدەکەی کرد. لە بەر خۆیەوە هەندێ شتی وت، دەنگێکی کز و لاواز وەڵامی دایەوە. سەیرێکی دواوەی کرد و ئینجا ئیشارەتی کرد لەوانیش کە بێنەژوورەوە. مستر لۆری باوەشی کرد بەناوقەدی کچە جوانەکە دا و هەڵیگرت و وتی: ((وەرە ژوورەوە وەرە ژوورەوە)).

ئەویش بە لێوە لەرزێ وەڵامی دایەوە: ((من ئەترسم!)).

((ئەترسی؟)).

((ئەرێ من لەو ئەترسم، لە باوکم)).

ئەو (مستر لۆری) دەستە لەرزۆکەکانی کچەکەی ئاڵاند لە ملی و تۆزێ هەڵیگرت و بە پەلە بردییە ژوورەوە.

لە نێو هۆدەکەشدا کارکردن بەردەوام بوو پیاوێکی سەر و ریش سپی، سەری لەناو خۆیدا بوو پشتی کۆمابوو. و بە سەر کورسیەکی درێژەوە خەریك بوو. زۆر سەری قاڵ بوو. ئەو خەریکی کەوش چاك کردن بوو.

# - ٢ -

# پینەچی

لەکاتێکدا سەر سپییەکە سەری بەسەر کارەکەیدا دانەواندبوو ، مانسیۆر دیفارج وتی: ((رۆژ باش)).

سەرسپی بۆ چرکەیەك سەری بەرز کرد و پاشان بە دەنگێکی کزەوە لەژێر لچەوە وتی: ((رۆژ باش)).

((دەتبینم ئێستاش هەر بەسەختی کار دەکەیت)).

لە پاش ماوەیەکی درێژ بێدەنگی لەپڕ سەری بەرز کردەوە و وتی: ((بەڵێ من ئێستاش هەر خەریکی کارم!)).

کزی و لاوازی دەنگ هەر زۆر جێگەی داخ و ئەسەف بوو. گومان دەکرا ئەمانە نەك هەموو هۆی ناتەواوی و زەعفێکی دەرونی خۆی بێت بەڵکو هۆی نەبوونی تەجروبەش بوو. پیاوەپیرەکە دەستێ جلی شڕی لە بەر دابوو. ریشی سپی کردبوو دەم و چاوی قوپابوو بە چەشنێکی هەراسان چاوی دەرتۆقی بوو کە نیشانی ئەدا کە بەشێوەیەکی ناسروشتی وای لێهاتبێت. سەیری چاوپێکەوتن کەرەکانی نەکرد. لەوانەیە وا دیار بێ کە ئەو نازانێ کەس لەویایە. لەوانەیە بە بۆنەی مانەوەی زۆری لە زینداندا مێشکی تێکچوبێت. مستر لۆری بەبێدەنگ هاتە پێشەوە لویس لە پاڵ دەرگاکەدا جێ هێشت. دیفارج وتی: ((وەرە! تۆ چاوپێکەوتنت هەیە ئەو پێڵاوانەی کە ئێستا خەریکی دروستیان دەکەیت نیشانیبدە و پێیان بڵێ ئەمە چ جۆرە پێڵاوێکە؟)).

دەنگێکی لاواز وەڵامی دایەوە: ((وتی ئەمە پێڵاوی ئافرەتانەیە. بۆئافرەتێکی جوانکیلە ئەمە لە مۆدەی نوێیە. بەڵام من قەت پێڵاوی وام نەدیوە بەس تەنها نموونەکەیم چاو پێ کەوتووە. بە تۆزێ لە خۆبایی بوونەوە سەیری پێڵاوەکانی کرد. بۆ ئەوەی ئەو پێڵاوانە دەستکردی دەستی خۆیەتی ئەوەندەیتر لە خۆبایی بوو فیزی کرد.

مستر لۆری پرسیاری کرد: ((ئەوە تۆ ناوت چییە؟)).

((ناوی من؟ ناوی من! قەڵای باکووری سەد و پێنجە)).

((چی؟ یانیٚ بە تەواوی وایە قەڵای باکووری سەد و پێنج)).

لۆری پرسی:)) تۆ کارت پینەچییەتی نییە. وایە؟ تۆ کارت ئەمە نییە؟)).

پیاوەپیرەکە تۆزیٚ وەستاو وتی: ((نە کار و کاسبی من پینەچییەتی نییە. ئەمەش لەزینداندا فێر بووم. مەجالیان دام کە فێر بم)).

مستر لۆری بیٚ چاو تروکاندن سەیری دەم و چاوی ئەوی دەکرد.

((دکتۆر مانێت تۆ منت لە بیر نایەت؟)).

پێڵاوەکان لە دەستی داکەوت. بە سەرسوڕمانەوە سەیری پرسیارکەرەکەی کرد ((دکتۆر مانێت تۆ مانسیۆر دیفارجت بیر ناکەوێتەوە؟ تۆ جارویس لۆری، خەزێنەدارەکەت بیر ناکەوێتەوە؟)).

مانێت بەتیٚ‌ڕوانینێکی دیلێکی چەند ساڵە یەك بە یەك سەیری دەکردن. بەڵام دیسان ئەو نیگایە بەدالّغەوە دەڕۆیشت. وەها کە دەماری بیرکردنەوەی کوێر ببوو. بیر و رای لەو شەوە زەنگەدا نوقم ببوو. دەستی پێڵاوەکانی هەڵگرتەوە درێژەی بە کارەکەی خۆی دایەوە.

لەو کاتەدا کە ئەو سەری دانەواندبوو بە سەر کارەکەی خۆیدا، هێدی هێدی لویس خۆی کێشا بەرەو کورسییەکەی کە لەسەریدا کاریدەکرد. چەقۆکەی لەدەستدا کەوت، دانەوی کە هەڵی بگرێتەوە. سەیری کراسەکەی لویسی کرد. بە روانینێکی خەمڵاوە و نەترسەوە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو بە دالّغەی کچەکەدا چوو. حازربوانیش هەر ئەترسان! ئەو چەقۆکەی بە دەستەوە بوو، بەڵام کچەکەیش یەك دەنك هەستی بە ترس نەدەکرد و ترسنۆکیش تێدا دیار نەبوو.

((تۆ کێیت؟ نابیٚ کچی زیندان وانەکە بیت؟)).

ئەویش ئاهێکی هەڵکێشا وەڵامی دایەوە: ((نە)).

((ئەی تۆ کێیت؟)).

نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە، بۆیە لە تەنیشت ئەودا لە سەر کورسییەکە دانیشت. دوکتۆر مانێت تۆزی کشا بەولاوە. خۆی لە لویس دوور خستەوە بەڵام لویس دەستی کێشا بە سەر شانی (مانێت)دا، ئەویش چەقۆکەی داخست و دەستی کرد بە روانین بە کچەکەدا. قژە خاوە

تەلاییەکەی بە سەر شانیدا پەخش ببوو، بە شەرم و ترس و لەرزەوە دەستێکی کێشا بە سەر قژیدا. پاشان ئاهێکی قووڵی کێشا و بەردەوام لە سەر پینەچییەتییەکەی خۆی مایەوە.

دیسان وەستا، قژەکانی لویسی گرتەوە نزیکی کردەوە سەیریکرد.

وتی: ((ئەمەتە. خۆیەتی. بەڵام شتی وا چۆن ئەبێ)).

دەستی گێڕایەوە بە ملی خۆیدا کێشای و نەوی لە پەتە ڕێسراوەکە کە بە سەرەبڕشت دروستیکردبوو لەسەرخۆ و بە دیقەت نایە سەر ئەژنۆی خۆی و خاویکردەوە کە بەشێکی لە چەند تاڵە مووی تەلایی کە چەند ساتێك لەمەو پێش خۆی رستبووی دروستکرابوون.

دیسان قژی کچەکەی گرتەوە قولەمشتی و لەسەرخۆ چاوی پیا خشاندەوە.

((هەر خۆیەتی. بەڵام شتی وا چۆن ئەبێت؟ خۆ ئەو شەوەی کە من بانگکرام بۆ دەرەوە ئەو قژەخاوەکانی خۆی بە سەر شانمدا شۆڕ کردەوە. وەختێکیش کە هێنامیان بۆ قەڵای شیمال هەر هێشتا تاڵێ موو هەر بە سەر شانی پاڵتاوەکەمەوە مابوو!)).

هەڵگەڕایەوە بە لای کچەکەدا و بە پەژارە و توڕەییەوە لای کردەوە. بەڵام کچەکە هەر هێشتا لەشوێنی خوی دانیشتبوو بەبێ ترس. دیفارج و مستر لۆری بۆیارمەتی کچەکە هاتبوون. لویس وتی: ((ببوورن. سەروەرەکانم نەیەنەپێشەوە بۆ لامان. بێدەنگ بن، وشك بووەستن. مەجوولێن)).

مانێت قیڕاندی ((ئەوە دەنگی کێبوو؟. تو ناوت چییە؟)).

((ئاخ. گەورەم تۆپێویستە لەکاتێکیتردا ناوی من ببیسیت. ئەبێ بزانی دایکم کێ بووە باوکیشم کێ بووە. بەڵام من ئێستا ناتوانم پێت بڵێم. ناتوانم پێت بڵێم ئێرە کوێیە. ئەوەش کە ئێستا لێرەدا پێت ئەڵێم ئەمەیە کە من تۆم خۆش ئەوێ. داوات لێدەکەم ماچێکم بکەیتەوە. رووی خۆشەویستی خۆمت لێئاشکرا کەم. وەك منالێك دەستی خستە سەر شان و ملی پیاوە پیرەکە و کێشای بەلای خۆیەوە و سەری خستە سەر سینە و مەمکی خۆی.

((سوپاس بۆتۆ خوایە سەردەمی غەم و نارەحەتی کۆتایی پێهات. هەر لێرەوە دەڕۆین بۆ ئینگلتەرا با هەر لە ئاسایشدا بژین ئاسایش ئاسایش، ئاسایش. سوپاس بۆ خوا کە لەم ئاکامەدا تۆی هێنایە ناو ئاشتی و ئاسایشەوە)).

بۆ ماوەیەکی زۆر هەروەها لە باوەشی کچەکە مایەوە. پاشان وردە وردە دەستی شلبوو

خزایە خوارەوە. هێمنیەکی ئەوتۆ دوا بەدوای ئەو تۆفانە سامناکەدا هات و ئەویش وەك منداڵێکی ساوا خەونێکی قورسی لێکەوت.

مستر لۆری دانەوەی پیاوە نوستووەکەی هەڵگرت ((ئەبێ بە پەلە و بەبێ دوا کەوتن هەڵیگرین و بڕۆین)).

لویس وتی: ((باشە! بە کەڵکی رۆیشتن بۆ سەفەر دێت؟)).

((بۆ رۆیشتن چاکترە لەوەی کە لێرە لە نێو ئەم شارە ساماوییەدا بمێنێتەوە؟)).

دیفارج وتی: ((راستە لە بەر هەندێ هۆی تریش بێت مستر مانێت ئەبێ لە دەرەوەی فەرەنسەدا بێت. دەبێ بڕۆم گارییەك و چەند ئەسپێ بانگ بکەم)).

مستر لۆری وتی: ((ئەمەش فرمانێکە و ئەگەر ئەو فرمانەیش بۆبە ئەنجام گەیاندن بێت ئەوا من ئامادەم. منیش پیاوێکم هەر بۆئەم کارە ؟)).

خاتو مانێت وتی: ((کە وای لێهات دەی ئێمە لێرەدا جێبێلن خۆئەزانن کە ئەو چەندە هێمن بۆتەوە. کە چوونە دەرەوەش دەرگاکە دابخەن. ئێمە بە یەکەوە بەجێبهێڵن. مەترسن ئەو لەگەڵ مندا زۆر هێمن ئەبێت منیش هەروەها)).

هەر دووکیان پێکەوە چوونەدەرەوە بۆ ئەوەی تەرتیباتی رۆیشتنەکە رێکبخەن. هەر ئەو نە ئەوان رۆیشتن کچەکە دانیشت و سەیری باوکی کرد. شەوەزەنگ تاریك و تاریکتر بوو. مستر مانێت بە هێمنی راکشابوو تاکو تیشکی خۆری بەیانی لە درزی دەرگاکەوە خۆی نیشاندا.

کاتی رۆیشتن نزیکببووەوە.

وەك موعتادێك کە بە زەخت دابڕابێت دەستیکرد بە خواردن و خواردنەوەی هەر هەموو ئەو شتانەی کە بۆیان دانابوو. بەبێ دواکەوتن ئەو جل و بەرگانەی کە بۆیان هێنابوو لەبەریکرد و لەگەڵیاندا رۆیشت. لویس قۆڵی کرد بە قۆڵی ئەودا دەستی کێشایە دەرەوە و پێکەوە لەگەڵ (لویس)دا لە پلەکان هاتنە خوارەوە.

لە دەور و بەری مەیخانەکەدا هیچ کەس نەمابوو. کە رۆیشتنی ئەوان ببینێت. تەنها مادام دیفارج نەبێت کە ئەویش جیچکانی کردبوو پاڵی دابوو بە تەموی دەرگاکە دا خۆی لە هەموو شتێك کردبوو بە نابەڵەو وەك ئاگای لەهیچ نەبێت.

## - ٣ -

# دادگایی

لە ساڵەکانی (١٧٨٠)دا بانکی تیلسۆنەکان یەکێك بوو لە شوێنەوارە مۆدیل کۆنەکان لەلەندندا. شوێنێکی بچووك و تاریك و نوتەك و ناخۆش بوو بەڵام ساحیبەکانی بەو شوێنە تەنگ و بچووکە زۆر خۆشحاڵ بوون. ئەوەشیان دەزانی کە ئەگەر رواڵەتی شوێنەوارەکە تازەتریان دستکاری کراو بوایە ئیتر ئەو شوێنە جێی سەرنج و رێز نەدەبوو. لەنێوان چوارچێوەی دیوارە سەربەرزەکانیدا بەس تەنها کۆمەڵێك دەبینران کە بەفیز و دەمارەوە خەریکی ئاڵ و گۆڕ کردن و کاسبی کردن بوون کە زۆربەیان تەمەنیان زۆر لە سەرەوە بوو. دیار بوو کە ئەگەر هەرزەکارێك تێکەڵ بەوان بوایە ئەوا تا ئەو رۆژەی کە بەئەندازەی پێویست تەمەنی سەرنەکەوتایە ئەوا قەت مەجالی ئەوەی پێ نەئەدرا کە بێتە دەرەوە، بۆیە دەیان شاردەوە.

سەرلە بەیانییەکی مارس یەکێك لە کارمەندە کۆنەکانی بانکی تیلسۆنەکان نێردرا بۆ لای جێرمی کرانچر، ئەو پەیامهێنەرەی کە بەردەوام لە دەرەوەی ماڵەوە دادە نیشت.

کارمەندە پیرەکە وتی: «باشە تۆ ئەزانی دادگای لێکۆڵینەوە بێلیێ پیری بانگ کردووە؟».

جێری بە پەشۆکاوی وتی: «ب.. ب.. بەڵێ گەورەم».

«تۆ مستر لۆری دەناسی؟».

«چاکتر لەوەی کە بێڵی دەناسم گەورەم».

«زۆر باشە. دەی بچۆرە لای دەرگاوانەکەی دادگاکە و ئەم یادداشتە بدەرەدەستی مستر لۆری. جا ئەویش رێگەت دەکات بچیتە ژوورەوە. کە چوویتە ژوورەوە خۆت نیشانی مستر لۆری بدە و چاوەڕوان بە تاکو تۆی دەوێت».

جێری یادداشتەکەی هەڵگرت و تەعزیمێکی بۆ دەرگاوانەکە گرت و بەڕێ بوو بۆلای بێلی. کاتێك کە خۆی کێشا دەرەوە. نیازی بوو بە ناو ئەو کۆمەڵە خەڵکە رەش و روتەدا بڕوات کە هەموویان چاوەڕوان بوون لەشوێنی هاتنەژورەوەی تاوانبارەوە لە هاتنی تاوانبارێك و دیتنی ئەو لەزەت بەن. هەموو دەرگاکان بە دەرگاوان گیرا بوون بەڵام کاتێك کە جێری خۆی کرد بە ژوورا یادداشتەکەی نیشاندا یەکێك لە دەرگاکان کرایەوە و هاتە ژورەوە.

جێری لەتەنیشت خۆیدا لەپیاوێکی پرسی: ((ئەو هۆکەی تر چییە؟)).

((چارلز دارنی — ئەو پیاوەی کە تاوانبار کراوە بەمەی کە یارمەتی پاشای داوە)).

مستر کرانچر چاوی لەدەرگاوانەکە بوو کە یادداشتەکەی بە دەستەوە بوو دەڕۆیشت بۆ لای مستر لۆری کە بە سەر کورسییەکەوە لەگەڵ چەند قازییەکیتر دانیشتبوو. کە یەکێك لەوان مستر سترایڤر بوو. ئەو لە ((دارنیەوە)) دیار بوو کە هەندێ بەڵگەنامەی بە دەستەوە بوو. لە بەرامبەری ئەودا دەرەبەگێك دانیشتبوو کە هەر چاوی لە سەقفی هۆڵەکە مڕ کردبوو. کاتێك کە مستر لۆری کرانچری دیت بە هێمنی تێی کوتا و ئاگاداری کرد.

بە هاتنە ژوورەوەی قازی گەورە هەموو قسە و دەنگ کردنێك کۆتایی پێهات. پاشان زیندانییەکە هێنرایە ژوورەوە. هەموویان ئەیانویست چاویان پێی بکەوێت تەنیا یەك نەفەر نەبێت کە بۆ خۆی بە قووڵی چاوی بڕیبووە سەقفی هۆڵەکە و ناویشی سایدنی کارتۆن بوو.

زیندانییەکە پیاوێکی گەنج بوو لە تەمەنی ٢٥ساڵیدا. وادیارە پیاوێکی ماقووڵ بێت لەسەرخۆ و بەهێمنی سەری رێزی بۆ قازی گەورە دانەواند.

بێدەنگی لە هۆڵی دادگاکەدا حاکم بوو. دوێنێ چارلز دارنی رایگەیاندبوو کە بێگوناهە بەڵام ئەو تاوانبارە بەوەی کە یارمەتی لویس پاشای فەرەنسای داوە لەشەڕەکانیدا بەرامبەر بەپاشای ئینگلتەرە. ئەو تاوانبار کراوە بەوەی کە لە نێوان ئینگلتەرا و فەرەنسادا هات و چۆی کردووە و ئەو کۆمەڵە زانیارییانەی کۆ کردۆتەوە کە پاشای ئێمە چەند و چۆن هێزی چەکداری رەوانەی کەنەدا و باکووری ئەمریکا

کردووه.

پیاوه تاوانبارەکە بەبێدەنگ گوێگرت لە ئەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵی بەڵام هەر بەو بێدەنگییە رووی کردە هۆڵی دادگاکە و ئیشارەتی کرد لە دوو نەفەر کە لە لای چەپیەوە دانیشتبوون. رواڵەتی گۆڕابوو گۆڕانێکی وەها کە هەموو کەسێ باری سەرنجی بۆلای ئەو دوو کەسە راکێشا. یەکێك لەو دوانە ئافرەتێك بوو لە تەمەنی بیست ساڵیدا ئەوی دیکەش پیاوێکی ماقووڵ بووکە زۆربەی مووی سەری سپی کردبوو وادیار بوو باوکی ئەو بێت. لویس کە پیاوە ماقووڵەکە قۆڵی کردبوو بە قۆڵی باوکیدا، بە پەژارەیەکی زۆرەوە سەیری زیندانییەکەی دەکرد. جێری لە ناو کۆڕی خەڵکەکەدا تێگەیشت کە ئەوان چاودێری زیندانییەکە ئەکەن.

وەکیلی لایەنگر هەستایە سەر پێ و بەسەرهاتەکەی بۆ قایمەقا دادگاکە گێڕایەوە. وتی: ((ئەم زیندانییە بە مەبەستی کاسبی کردن وەك پیشەیەك لە نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرا دا هاتو چۆی کردووە. چ کاسبییەك هەیە ئاشکرا نەبێت. بەڵام خۆشبەختانە پیاوێکی چاکی وەك جان بار ساد کە سەردەمێك دۆستی زیندانییەکە بووە و راجێر کلای کە خزمەتکاری ئەو بووە لە زیندانەکەدا ئەو بەڵگەنامەی دۆزییەوە. کە ناوەڕۆکی بەڵگەنامەکان لیستەی هێزەکانی ئینگلتەرایی و شوێنی جێگیر بوون یان بووە. پارێزەری لایەنگر درێژەی پێدا و وتی: ((ناتوانین سوور بین لە سە ر ئەوەی کە ئەم بەڵگەنامە بە دەست و خەتی زیندانییەکە نووسرابێت. ئەمە نیشانئەدات کە وادیارە ئەو زیندانییە زیرەکە و سەرچاوەیەکی زانیارییەکانی سەربازی بووە بۆیە تێکۆشاوە کە بەم شیۆە لە هەر چەشنەرووداوێك ئاگادار بێت)).

لەپێشدا جان بارساد شایەدەکەی بەم راستییانە وریا کردەوە.

لە دوای ئەوە مستر سترایڤر کە لایەنگری چارلز دارنی بوو بە چەند پرسیار ئەوەی تاقیکردەوە:

((ئایا قەت جاسووسیت کردووە؟)).

((باوەڕتان بێت نە)).

((قەت زیندانی کراویت؟)).

((نە)).

((قەت لە بەر قەرزاریش زیندان نەکراویت؟)).

((شتێکی وا نابینم کە لە سەری وام لێ بە سەر بێت)).

((قەت لە بەر قەرزاریش زیندان نەکراویت؟)).

((بەڵێ)).

((چەند جار؟)).

((دوو یان سێ جار)).

((ئایا تا ئێستا بە بەدکاری و بێبڕوایی تاوانبار کراویت؟)).

((تەنها یەکجار ئەویش لە یاری کارتدا بوو وایان پێ وتم بەڵام خۆ ئەوان مەست بوون ئاگایان لە خۆیان نەبوو)).

((ئایا تۆ دڵنیایت کە ئەو زیندانە دەناسیتەوە؟)).

((بەڵێ)).

((تۆ چاوەڕوانی ئەوەیت پارەیەکت پێ بدرێت بۆ ئەو بەڵگەنامە؟)).

((بڕواتان بێت، قەت)).

**پاشان، راجێر کلای هات و وتی هەندێ جار بەڵگەنامەی لەو جۆرەم لە گیرفانی زیندانییەکەدا دیتووە لەو کاتانەدا کە جلەکانیم دەق کردووە. ئەو بەڵگەنامانەش کە بەدادگا نیشاندراون هەر لە هۆدەکەی ئەودا دۆزیومەتەوە.ئەو چاوی لێ بووە کە لە »کالایس«دا«ئەو لیستە و بەڵگانەی نیشان کابرایەکی فرەنسی داوە. راجێر کلای لەلایەن مستر سترایڤرەوە پێی راگەیەندراوە کە ئەبێ قەبووڵیبکات کەماوەیەك لەمەو پێش دز بووە.**

پاش ئەمە مستر لۆری هات. پرسیاری لێکرا ئەگەر لەمەوپێش زیندانییەکەی دیتبێت. وتی کە ئەوی دیوە لە کلایس لەکاتێکدا کە بە سەر تەختەی پاپۆڕەکەدا پەڕیوەتەوە..

((چ کاتێك بوو کە ئەو لە تەختەی پاپۆڕەکە پەڕیەوە؟)).

((تۆزێ پاش نیوەشەو)).

((ئایا تۆ لەو سەفەرەدا هیچ هاوڕێیەکت بوو؟)).

((دووهاوڕێم هەبوون. پیاوێك و ژنێك كە لێرە حازرن)).

((میس مانێت)).

کیژۆڵەیەکی جوان کە پێش ئەوەی هەستێتە سەر پێ هەموو دانیشتوان لایان کردەوە بەلایەوە.

((میس مانێت سەیری زیندانییەکەی کرد)).

بۆ چارلز دارنی زۆر ناڕەحەت بوو کە بەرامبەر بەو حەشیمەتە راوەستێ بەڵام تا ئێستاش هەر بێ دەنگ و بێ جووڵە وەستابوو. بەڵام روو بە رووبوونەوە لەگەڵ لویس (مانێت)دا. رەنگی دەگۆڕێت و دەکەوێتە لێوە لەرزە.

((خاتوو مانێت. تۆ قەت ئەم زیندانەت دیوە؟)).

((بەڵێ گەورەم)).

((لە کوێ؟)).

((بیرم کەوتەوە بە سەر تەختی سوار بوونی پاپۆڕەکەوە)).

((تۆ وت و وێژت لەگەڵ زیندانییەکەدا کرد؟)).

((کاتێك هاتە ئەم بەرەوە هەستیکرد کە باوکم زۆر هیلاکە و هێزی تیا نەماوە پیاوانە بە گوێرەی پێویست یارمەتیداین و باوکمی لەبا و بۆران رزگار کرد)).

((ئەی ئەو بەتەنیا هاتە ئەمبەرەوە؟)).

((نە)).

((چەند کەسی لەگەڵ بوو؟)).

((دوو ئەفەندی فەڕەنسی)).

((لە بەینیاندا هیچ بەڵگەنامەیەك ئاڵوگۆڕ کرا وەك ئەم بەڵگانە؟)).

((چەند بەڵگەیەك بەڵام نازانم ناوەڕۆکی بەڵگەکان چی بوون؟)).

((ئەی ئەم زیندانییە چی پێ وتی؟)).

((ئەو زۆر بەرەحم و بەزەیی بوو، بۆ باوکیشم کەڵکی زۆر بوو)). لەم کاتەدا شایەتەکە دەستیکرد بەگریان بێدەنگ و چاوەکانی پڕ بوو لەفرمێسك.((هیوادارم

لەجوابی چاکەی ئەودا هیچ ئازارێکم پێ نەگەیاندبێت)).

((خاتوو مانێت گشت کەسێ ئەزانێ کە هاتنی تۆ بۆ ئەم دادگایە چاوەڕوان نەکراو بووە و تۆ وەك ئەرکی سەرشانی خۆت هاتوویت، تکایە درێژەی پێبدە)).

((وتی پێم کە ئەو خەریکی هاتوچۆ کردنە بە مەبەستی کاسبی ئیشی شت و مەکی ناسك و بەنرخ دەهێنێ بۆیە کە ناوی خۆی دەگۆڕی، وتیشی نیازی هەیە بەم زوانە هاتوچۆی نێوان فەرەنسە و ئینگلتەرا بکات)).

((ئەی باشە دەربارەی ئەمە هیچی نەوت؟)).

((ویستی درێژە بدات کە چۆن کێشەکە دەستیپێکرد و بە بیر و رای ئەو ئینگلتەرا تاوان بار بوو. هەروەها بە گاڵتەوە وتی لەوانەیە جۆرج واشنتون لە مێژوودا بەناوبانگتر بێت لە جۆرجی سێیەم)).

قازی گەورە سەری لە یادداشتەکانی خۆی هەڵبڕی و بە رواڵەت دیار بوو توڕە ببوو لە قسەکان. هەموو خەڵك چاویان بڕیبووە شایەدەکە لەو کاتەدا کە ئەم قسانەی دەگێڕایەوە.

پاشان دکتۆر مانێت بانگکرا و پرسیاری لێکرا ئەگەر زیندانییەکەی دیبێت یان نە؟

((بەس یەك جارم دیوە ئەویش کاتێك لە لەندەن هات بۆ لام)).

((ئایا لەناو پاپۆڕەکەدا هاوسەفەری تۆ بوو؟)).

((ناتوانم بڵێم)).

((هۆیەکی تایبەتی تێدایە کە ناتوانی بڵێیت؟)).

((هەیە)).

((ئەو یەکە بۆتە هۆی بەدبەختی و ئازاردانی تۆ لە ماوەیەکی درێژی زیندانیدا لە وڵاتەکەی خۆتدا بە بێ ئەوەی کە دادگایی بکرێت و بە تاوانبار ناسرابێت؟)).

((ماوەیەکی درێژی زیندانی)).

((تۆ لەو ماوەدا زیندانی بوویت و ئێستا رزگار کراویت؟)).

((وام پێ ئەڵێن)). ((وام پێ ئەڵێن)).

((بەڵام ئەی تۆ هیچت لەبیر نایەت؟)).

((هیچم لە بیر نایەت دەربارەی ئەو ماوەی کە لەزینداندا خەریکی پینەچییەتی بووم و ئەم کاتەی کە خۆم لە لەندەندا بینیمەوە لە پاڵ کچە خۆشەویستەکەمدا ئەژیم)).

شایەدێك بانگکرا کە وتبووی ئەو زیندانییەی لەشارێکدا دیوە کە لەوێ مەیدانێکی گەورە ئۆردوگایەکی سەربازی تێدا بووە. قازییەکان ئەیان ویست بیسەلمێنن کە ئەو بەبۆنەی کۆکردنەوەی زانیاری گرینگی سەربازی رۆیشتووە.

**سایدنی کارتۆن لە هەر هەموو ئەو ماوەدا بێدەنگی خۆی پاراست و هیچ سەرنجی نەدایە. هەر لەو شوێنەدا بۆ خۆی دانیشتبوو. هەر سەیری سەقفی هۆڵەکەی دەکرد. بەڵام لە پڕدا چەند کەلیمەیەکی بە سەر لەتێ کاغەزەوە نووسی و فڕێدا بۆ مستر سترایڤر. مستر سترایڤریش پاش خوێندنەوەی ئەو چەند وشەیە وتی بە شایەدەکانی وت:**

((باشە ئێوە سوورن لە سەر ئەوەی کە ئەم زیندانییە بۆ بێت؟)).

((بەڵێ، بە تەواوی سورین)).

**((قەت کەسی ترتان لە شێوەی ئەم زیندانە دیوە؟)).**

((قەت لە شێوەی ئەم نەدیوە کە بڵێم سەهوم کردووە)).

((دەی بە باشی سەیری ئەو پیاوە بکەن. دۆستی رۆشنبیر و دانای منە)).

مستر سترایڤر لەکاتێکدا کە پەنجەی بۆ ئەو پیاوە دەکێشا کە لەتە کاغەزەکەی بۆفڕێ دابوو وتی: ((دەی بەباشی سەیری ئەو دۆستە رۆشنبیرەی من بکەن)).

((لە بیر و بڕوای ئێوەدا هەیە کە ئەوە زیندانی بێت؟)).

ئەگەر چی دۆستە رۆشنبیرەکەی ئەو غەمبار و تەپ و تۆزاوی و سەر و چاوی لێڵ بوو بە رواڵەت بە خۆی دانەدەگەیشت و جل و بەرگی وەك جل و بەرگی حاکمێك کردبووەبەر خۆی. هەموو خەڵکی ناو هۆڵی دادگاکە بە کەم لوتفییەوە سەیریان دەکرد و هەموویشیان زۆر بەلایانەوە سەیر بوو.

مستر سترایڤر وتی: ((ئەگەر بە رێکەوت پیاوێك لە وێنەی ئەم زیندانییە لە ناو ئەم هۆڵی دادگایەدا پەیدا ببێت، لەوانییە بەرێکەوت پیاوێکی تریش لە ناو ئەو

ئوتێلەدا بوو‌بێت. کە وای لێهات شایەدییەکەش هیچ سوودی نەبوو)).

ئیتر شایەتی تر نەمابوو کە گوێی لێبگرن بۆیە وتاری دوایی خوێندرایەوە. قازی گەورە تێبینی خۆی راگەیاند. هەر دوانزدە ئەندامی دەستەی سەرۆکایەتی دادگاکە بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی کۆڕەکە هۆڵی دادگاکەیان جێ هێشت.

مستر کارتۆن ئەبوا ئاگاداری زۆر شت بووایە کە رووی ئەدا نەك خۆی ئاشکرای بکات. لەوانەش کاتێك کە خاتوونە مانیەتی بە کزی و لاوازی دیت خۆی یەکەم کەس بوو کە دەستیکرد بەگریان.

((ئەفسەر! یارمەتی ئەو ئەفەندییە بدە با ئەو ئافرەتە جوان عەمرە لەهۆڵی دادگاکەدا ببەنە دەرەوە، مەگەر چاوت لێ نییە خەریکە ئەکەوێت؟)).

زیندانییەکە وا دیار بوو کە زۆر بەپەرۆش بوو بۆ ئەو زەحمەتەی کە سازی کردبوو بۆ خاتوو مانێت و داوای لە مستر کارتۆن کرد کە پێی رابگەیەنێ کە ئەو زۆر بە پەرۆشە سەبارەت بەو پەژارەی کە ئەو بۆی دروستکردووە.

هەیئەتی دادگاکە بۆ ماوەی سەعات و نیوێك بزر بوون لەو ماوەدا جێری کرانچیر تەخت خەوی لێکەوتبوو. بەڵام کە بەهاتنەژوورەوەی ئەوان خەبەری بووەوە، خێرا رایکرد بۆ لای مستر لۆری و لەتێ کاغەزی وەرگرت کە بە پەلە تێدا نوسرابوو ((تاوانبار نییە)).

- ٤ -

# سایدنی کارتۆن

لە دەرەوەی دادگاکەدا مستر چارلز چاوپێکەوتنی کرد لەگەڵ دۆستەکانی کە بریتی بوون لەمانە: دکتۆر مانێت، لویس مانێت، مستر لۆری، مستر سترایڤر، ئەو کەسەی کە پارێزگاری لێدەکرد و مستر کارتۆن یاریدەرەکەی مستر سترایڤر.

ناسینەوەی دکتۆر مانێت وەك پینەچییەکەی ناو زیندان زۆر نارەحەت بوو. ئەو هاتۆتەوە نیازی هەیە ئەو گوزەرانە پڕمەترسییەی خۆی ببووژێنێتەوە. دەم بە پێکەنین و رووخۆش لە لای راستیانەوە راوەستابوو لەروانیندا ماق مابوو. هەندێ جار بیری زیندانیبوونەکەی خۆی دەکەوتەوە تارماییەکی رەش بە سەریدا دەهات. تەنیا خۆشەویستەکەی (کچەکەی) لە بەر دەستدا بوو بۆ بەهێزکردنی ئەو لە لابردنی ئەو پەژارە و ماتەمیەدا.

مستر دارنی بە سوپاسەوە دانەوی و دەستی خاتوو مانێتی ماچکردەوە. پاشان بە گەرمی سوپاسی مستر سترایڤر کرد و وتی: «مستر دارنی من زۆر خۆشحاڵم کە لە ژیان و تایبەتمەندییەکانی تۆ لایەنگریم کرد. هەر چەند ئەمە هێرشێکی گەورە بوو بەرامبەر بە تۆ بەڵام خەتەرناکیش بوو».

دارنی وەڵامی دایەوە: «تۆ ژیانی منت پاراست منیش نابێ قەت لە بیرم بچێتەوە».

مستر لۆری وتی «ئێستاش هەر هەموومان رۆژێکی پڕ لەهیلاکیمان بوو. خاتوو لویس دیارە نەخۆشە مستر دارنی کاتێکی پڕلە مەترسی لەپێشدا بوو و ئێمەش هەموومان نائومێد بووین دەبا هەموومان بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە ئیتر بخەوین».

مستر سترایڤر وتی «تۆیش قسە بۆ خۆت ئەکەی من شەوکارم هەیە بە شەودا کار ئەکەم».

دکتۆر چاوی بڕیە دارنی و بەو نیگایەش پیاچوونەوەیەکی نامۆیی هات بە بیردا.

ئەمەش نیگایەکی قیناوی و پڕ لە مەترسی بوو.

لویس کە دەستی بە سەر ئەودا رادەکێشا وتی: ((باوکە ئەکرێ بڕۆینەوە بۆ ماڵەوە؟)).

ئەویش هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی ((بەڵێ)). ئەم جا گاریەك بانگکرا و باوك و کچەکەی سوار بوون و کەوتنە رێ. مستر سترایڤریش هەر رۆی. مستر لۆری کەوتە دوای. دارنی و کارتۆن بە تەنیا مانەوە.

کارتۆن وتی ((مستر دارنی تۆ بۆچی کزی؟)).

دارنی وەڵامی دایەوە ((هەستئەکەم زۆر بێدەماخم)).

((دەی وەرە با پێکەوە بازێ شەراب بخۆینەوە. لێرە میوانخانەیەکم شارەزایە خواردنەوەی خۆشی لایە)).

بە خێرایی هەر دووکیان بەرامبەر بە یەکتری لەوێ دانیشتن.

کارتۆن پرسیاریکرد: ((تۆ هەستدەکەی دیسان بگەڕێیەوە بۆ جیهان؟)).

((بەڵێ وا ئەزانم تائێستا سەرم لێ تێکچووە، بەڵام پێموایە کە ئەبێت)).

کارتۆن پەرداخێکی لە شەراب پڕکرد و هەڵی قوراند.

وتی: ((ئیتر ئەمە ئەبێ قایلت بکات. خۆیشم هەروەها ئارەزووی گەورەشم ئەمە بووە بگەڕێمەوە بۆ دنیای خۆم. دنیا بۆ من نەبووە، منیش باش نەبووم بۆدنیا)).

چارلز دارنی نەیزانی چۆن وەڵامبداتەوە.

کارتۆن درێژەی پێدا: ((هاورێ خاتوو لویس کیژۆڵەیەکی جوانکیلەیە ئەزانی؟ باشە چۆن کچێکی ئاوا بەسۆز هەرزە کار ئەو هەستەی بۆ دەهات دەستکاتە گریان؟! ئەو بەزەیی بە تۆدا دەهاتەوە دەگریا من خۆم چاوم لێبوو کە بۆت دەگریا)).

دیسان دارنی هیچ وەڵامێکی نەدایەوە بەڵام لە بەر ئەوەی کە لە دادگاییەکەدا هاوکاری ئەوی کردبوو سوپاسی کرد.

ئەویش وەڵامی دایەوە: ((من نە ئەمەوێ تۆ سوپاسم بکەی و شیاوی سوپاس نیم. مستر دارنی مەجالم بدە با پرسیارێکت لێبکەم تۆ ئەزانی منیش لە تۆ ئەچم؟)).

((بە راستی مستر کارتۆن قەد بیرم لێ نکردۆتەوە)).

((باشە. کە وایلێهات هەر ئێستا بیری لێبکەرەوە)).
دارِنی وەڵامی دایەوە: ((تۆ بە کارەکانتا نیشانتداوە کە لەمن ئەچی)).
((بەڵام قەت لەو باوەڕەدا نیم تۆئیشی وات کردبێ)).
((ئەمنیش لەو باوەڕە دا نیم ئیشی وام کردبێت . هیچمان)).
دارِنی وتی: ((بەڵام تا ئێستاش هیچ خاڵێك نییە رەفتار و دۆستایەتی ئێمە قەدەغە بکات. روخسەتم بدە با وێری من بێت)).
کارتۆن وتی ((حەز دەکەی هینی هەر دووکمان حەسێب کەی؟)).
دارِنی وەڵامیدایەوە ((ئەرێ حەز ئەکەم)).
کارتۆن وتی: ((ساقی مەیگێڕ شەڕابی زۆرترم بۆ بێنە. لە سەر سەعات (دە)یشدا لە خەو هەڵمسێنە)).

لیستەی خواردنەوەکە حسابکرا و دارِنی شەوێکی خۆشی بۆکارتۆن بە ئاوات خواست. کارتۆن کە تەنیا مایەوە هەستایە سەرپێ و سەیری خۆی کرد لەئاوێنەیەکدا کە لە بەرامبەریەوە بەدیوارەکەدا هەڵواسرابوو. لەئاوێنەکەدا خۆی بە پیاوێکی بە توانا و ژیر و دڵ فراوان زانی بەڵام ئەو توانایە قەت بە رێگەیەکی باش کەڵکی لێ وەرنەگیرابێت زۆر لەدارِنی تورِە بوو چونکە دارِنی زۆر لەروخساردا لەئەو ئەچوو بەڵام لە چەن لایەکیترەوە زۆر لەو باشتر و بەرزتر بوو. لەولایشەوە لویس، بیری لویس دڵی بردبوو نەکا لویس پیاوێکیتر دڵی برِفێنێ. شەڕابی زۆرتری خواردەوە. دەستی کێشا بەسەر شانی خۆیدا و خەوی لێکەوت.

پاش چەند سەعات مەیگێڕەکە هات و کارتۆنی لەخەو هەڵساند و ئەویش خۆی گورج کردەوە و بەرەو هۆدەکەی سترایڤر کەوتە رێ بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە سازدانی رێ و شوێنەکانی کارەکانی رۆژی دواتر.

سایدنی کارتۆن لەو کاتەدا کە مستر سترایڤر بە سەر تەختێکەوە راکشابوو کارەکانی ئەنجامدا. هەردووکیان پێکەوە لە پەسا شەرابیان دەخواردەوە. بۆ ئەوان رۆژی خۆیان بوو هەردووکیان سەرخۆش بوون.

کاتێك کارتۆن هەموو بەڵگەنامەکانی ئامادە کرد. بردنی بۆ لای مستر سترایڤر

پاش پێکەوە زۆرتر لێکۆڵینەوە شەڕابی زۆرتریشیان خواردەوە.

مستر سترایڤر وتی: ((سایدنی، ئەوا هەموویمان تەواو کرد)).

تۆ ئەمڕۆ کێشەکەت باسکردەوە. تۆ زۆر باش بوویت بۆ هەموو پرسیارێك جێگەی خۆی دیاریکرد. تۆ بە تەواوی ئەو شایەدانەت تێشکاند)).

کارتۆن وەڵامی دایەوە: ((من دایم باشم. وانییە؟)).

((ناتوانم نکۆلی بکەم. بەڵام چی بوو بە هۆی ئەوەی کە سروشتت تێك بچێت؟! خۆ تۆ دایم لەسەرخۆیت. هەر ئەو سایدنی کارتۆنەیت کە هاوقوتابی من بوویت دەئێستاش های لەپلەیەکی بەرزدا و نائومێدیت)).

((بەڵێ هەر ئەو کەسەم هەر ئەم کەم شانسەم. تا کاتێکیش لە قوتابخانەدا بووم ئەچووم بە جێی کوڕەکانیتر تاقیکردنەوەم دەکرد لە جیاتی بۆ خۆمی بکەم)).

((ئاخر عەیبەکەی تۆ هەر ئەوە بوو. بۆیە ئێستاش لە هەوڵەکانتا وزە و مەبەست نەماوە. ئەی بۆچی من لە هەوڵەکانمدا دایم سەرکەوتووم، بۆ، تۆ تێشکاوی؟)).

((ئاخر بەشێکی لە بەر ئەوەیە کە تۆ ئەمرم پێدەکەی کە یارمەتیت بدەم و لە لایەکی ترەوە تۆدایم بیر لە داهاتووی خۆت دەکەیتەوە منیش هەر لەرابوردوو بیر دەکەمەوە)).

سترایڤر وتی: ((بەڵێ تۆ بە لای راستدا داکەوتی بەڵام من لەسەرخۆم مامەوە)).

کارتۆن درێژەی پێدا ((هەر لەو کاتەشدا کە لەپاریس پێکەوە قوتابی بووین تۆ هەر سەفەرت دەکرد بەم لاو بەولادا بەڵام من هەر لە شوێنی خۆمدا مامەوە)).

((ئەی ئەوە گوناهی کێ بوو؟)).

((لایبە با لە سەری نەڕۆین)).

مستر سترایڤر وتی ((دەی باشە وەرە با پێکەوە دوا پێك بخۆینەوە بە سەلامەتی شایەدە جوانەکەوە)).

((ئەو جوان نەبوو)).

((بەڵام جوانە، ئەو پەسەند کراوی ناو دادگاکە بوو)).

((ئەو دادگایە قازی تێدا نییە ئەوەندە جوان بێت)).

((تۆ گێـژت کـردم. مـن وام ئـەزانی لـە تـەواو مـاوەی دادگایەکـەدا ئـەو ئافرەتـە یەکجار شێتی کردوویت. بەڵام ئێوە زۆر پەلەتان ئەکرد بۆ ئـەوەی بـزانن ئـەو چـی بـە سەرا دێت)).

((گشت کەسێك چاوی لێبوو کە چی بە سەر هات..مـن ئـیتر ناخۆمـەوە ئەمـەوێ تۆزێ راکشێم)).

ماڵەکەی بەجێهێشت و بە ناو شەقامی سارد و ماتەمی داکەوتە رێ.

هەڵزنا بە هۆدەی خەوەکەیدا و پەڕیە سەر جێگای خـەیاڵ وخـەو کـە سـەرینەکانی بەفرمێسکی بێهودە خوسابوون.

ئێستاش هەر ئەو پیاوێکی باشە، چالاکە قەت نەیتوانیوە کارێکی چاك بـۆ خـۆی بکات و هێمنی و ئاسایش بدۆزێتەوە.

- ٥ -

# دكتۆر مانێت لە لەندەن

دوانیوەڕۆی رۆژێکی یەکشەمە، چوار مانگ پاش دادگایەکەی چارلز دارنی، مستر جارویس لۆری لەشەقامێکی بەرەو هەتاودا پیاسەیدەکرد. ئەو بەرێوە بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ دۆستەکەی خۆیدا بڕوات بۆ خواردنی نانی ئێوارە. دکتۆر دوو قات لە خانوویەکی باڵەخانەی بە کرێ گرتبوو لە یەکێك لە شەقامە هێمنەکانی لەندەندا. لەوێدا دکتۆر پارەیەکی بە گوێرەی پێویست لەو نەخۆشانەی کە ئەهاتن بۆ لای بە مەبەستی عیلاج و دەوا و دەرمان دەست ئەکەوت.

مستر لۆری بۆچوونە ژوورەوە بۆناو ماڵەکە دەستی نا بەزەنگی دەرگاکەدا.

((دکتۆر مانێت لە ماڵەوەیە؟)).

((هێشتا نەهاتووە، گەورەم)).

((ئەی خاتوو لویس لەماڵەوەیە؟)).

((قوربان هێشتا ئەویش نییە)).

((ئەی خاتوو پرووس هەیە؟)).

((قوربان دڵنیا نیم)).

((باشە کە وایلێهات ئەچمە سەرەوە چاوەڕوان دەبم)).

کچەکەی دکتۆر ماڵەکەی خۆش کردبوو کە گشت کەسێك حەزی لێدەکرد، ئاخر ئەو زۆر بەسەلیقە و بە دەستو برد بوو. هەر قاتێك سێ هۆدەی بوو کە دەرگای هۆدەکان کراوە بوون وەها کە بە ئازادی هەوا بەناویاندا هات و چۆی دەکرد. کاتێك کە لەم هۆدەبۆ ئەو هۆدە دەچوو. هۆدەی سێیەم سەرنجی بۆ خۆی راکێشا. لەویا مێزێك دانرابوو کە هێنی دانیشتنی دکتۆر مانێت بوو لەو سەردەمەی کە لەپاریسدا لەدوکانێکی مەیخانەدا دەیخواردەوە و جگەرەی دەخوارد و ئێستا کەڵکی لێ

وەرنەدەگیرا.

مستر لۆری بەدەنگی بەرز وتی: ((سەرم سوڕماوە ئەم کابرا هەموو شتێك دەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی ئەشکەنجەی خۆی بدات)).

دەنگی ناسکی خاتوو پرووس مستر لۆری راچڵەکاند کە وتی: ((ئەی تۆ بۆچی لەو شتە سەرت سوڕماوە؟)).

((تۆ چۆنی؟)).

((من زۆر چاکم. سوپاس ئەی تۆ چۆنی؟)).

((وەڵڵاهی من بۆ خانمە جوانەکەم دڵم تەنگە)).

((ئەتوانم بپرسم بۆچی؟)).

((چوزانم هەموو جۆرە کەسێك دێن بۆ چاوپێکەوتنی. هەر وەها زۆربەی ئەوانیش)).

مستر لۆری دەیزانی کە خاتوو پرووس بەمەی کە هەر کەس سەیری لویس بکات تووڕە دەبێت. لۆری دەیزانی کە ئەو یەکێکە لەو ژنانەی کە عەشقی پاك و خاوێنی خۆی کردۆتە قوربانی و هێواشی خزمەتکردنە بە کچێکی لاو و پێگەیشتوو. بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانەی کە لە ژیانی رەشی ئەواندا قەت نیشاننەدرابوون بدرەوشێنێتەوە. مستر لۆری وایدەزانی کە لە دونیادا هیچ شتێك لەوە باشتر نییە کە بە بیر و باوەڕ و خزمەت بە دڵ شکاوێك بکەیت و رێز و سوپاسی دانا بۆخاتوو پرووس بەبۆنەی ئەو هەلویستەیەوە. زیاتر لەوەی کە رێز بۆ ژنێکی دەوڵەمەند کەباقە پارەکانی لە بانکی تێلسۆندا هەڵچنیوە.

مستر لۆری وتی: ((مەجال بدە با پرسیارێکت لێبکەم. باشە دکتۆر لەگەڵ لویس قسە دەکات؟ قەت بیر لە سەر لە ئەو کاتە دەکاتەوە کە خەریکی پینەچیەتی بوو؟)).

((قەت؟)).

((خۆ شتێکی زۆر نامۆ نییە؟ هەموومان دەزانین کە ئەو بوو بە قوربانی تاوانێك کە نەیکردبوو. ئەو بۆ ئەبێ قەت بیری لێنەکاتەوە؟)).

((وابزانم ئەو مەترسی لەدەستچونی دووبارەی پوول و پارەکەی دەکات. کە دەبێتە

هۆی بێزارییەوە)).

((راستە)).

خاتوو پرووس درێژەی پێدا و وتی ((هەندێ جارانیش لە نیوەی شەودا رادەپەڕی و لە هۆدەکەی خۆیدا دەکەوێتە هات و چوو و خوار و ژوور کردن. جا خاتوونەکەی من دەچێتە لای و ئەمجا پێکەوە خوار و ژوور دەکەن تا ئەو وەڕەس دەبێت. بەڵام تا ئێستاش هیچ شتێکی دەربارەی ئەو نا ئارامییەی خۆی لای ئەو نەدرکاندووە)).

لەم کاتەدا شەقام دەستیکرد بە دەنگدانەوەی تەقەی پێ. وا گومان دەکرا بیرەوەری پیاسە ماندووەکان بۆتە هۆی ئەو تێفکرینە.

میس پرووس وتی: ((ئەوان لێرەن)).

میس پرووس بە دیمەنی خۆشییەوە پاڵتاو و کڵاوەکەی خۆشەویستەکەی (لویس) تەکاند و دەقی کرد و پرچە پڕەکەی دەقکرد، لویسیش هەر وەك ئەو بە رووخۆشییەوە سوپاسی کرد. دکتۆریش پێکەنین گرتی و وتی خاتو پرووس ئەوەندە رووی خۆشی پێداوە خراپیکردووە.

پاش خواردنی نانی ئێوارە چوونە دەرەوە بۆ ناو باخچەکە دانیشتن. لەوێ مستر دارنی هات بۆ سەردانی دکتۆر و لویس بە خۆشی چاوپێکەوتنی کرد. خاتوو پرووس کە وا دیار بوو تورە بێت ئەوانی بەجێهێشت و چووە دەرەوە.

کاتێك کەدانیشتن سەری قسەکانیان قۆستەوە بۆ باسی خانووە کۆنەکەی لەندەن.

لەم قسانەدا مستر دارنی لە دکتۆر مانێتی پرسی: ((باشە تۆ زۆربەی بورجەکانی لەندەنت دیوە؟)).

((من و لویس لەوێ بووین. زۆربەی ئەو بورجانەشمان دیوە. بۆ ئاگاداری ئەوانە زۆر جوانن)).

دارنی تۆزێ بە تورەییەوە وتی: ((خۆشت دەزانی منیش لەوێ بووم لەو کاتەدا وەك سەرهەڵداوێك دژی پاشا دەستگیرکرام هەر بۆیە نەمدەتوانی بیانبینم. چۆن پێیان دەوتم تۆ زانیاری کۆ دەکەیتەوە بۆیە لێرەیت؟)).

لویس پرسیاری کرد هۆکەی چی بوو؟)).

((له چەند گۆڕانکاریەکدا هەندێ کرێکار هۆدەیەکی کۆنیان دۆزییەوە. دیوارەکانی ئەو هۆدەیە بە نووسینی مێژوو ناو نیشان و دوعا و پاڕانەوە و هەندێ شتی تریش لەو بابەتە کە زیندانییە کۆنەکان نووسیبوویان پڕکرابووەوە یەکێك لەو وشە گەلەش نووسرابوو چاڵ (DIG) ئەمەش وەك گەڕان بۆ شتێ ناو تەختی هۆدەکە هەڵکنرابوو بەتاقەت پشکێنرا. کە لە ژێر بەردێکدا بازێ لاپەڕەی کۆن و پرتوکاو کە لە ناو جزدانێکی شڕدا مابوو دۆزرایەوە. ئاخر چۆن زیندانییەکی داماوی نەناسراو کە ئەوانەی نووسیبێ قەت نەخوێنرابووەوە. بەڵام بازێ شتی تایبەتی نوسیبوو)).

لویس هاواری کرد: ((باوە...! تۆ نەخۆشی؟)).

دکتۆر مانێت لە ناکاو راپەڕی کە دەستی گرتبوو بە سەریەوە. ئەو دیمەنەی دکتۆر هەموویانی زیرە پێکرد.

((نەکچم . نە.. من نەخۆش نیم. دڵۆپی زلەی باران کە دێتە خوارەوە من رائەپەڕێنێ باشترە بچینە ژوورەوە)).

بە خێرایی هەموو شتێکی لە خۆیدا شاردییەوە. بارانیش دەستیکرد بە بارین ئەویش پێستی دەستی نیشاندەدان کەباران تەڕی کردبوو. مستر لۆری روانی بەسەر نەوچەوانی دکتۆرەوە دلۆپی بارانی دی. هەر بەو نیگا رقاوییەوە دەی روانی بۆ مستر لۆری کە لە دەرەوەی دادگاکەدا تێی دەڕوانی.

دکتۆر وتی ((تۆفانێك بەڕێوەیە. بەڵام هێدی هێدی دێت)).

کارتۆن وتی ((بەراستی دێت؟)).

بە کورتی بوو بە هێرش و گرمەی تۆفان و بارینی تەرزەلوکە و هەورەتریشقە، بۆیە هیچ دەنگێك نەما کە ببیسرێت. لە دوای نیوە شەو پاش هەڵهاتنی مانگەشەو هەموو شتێك تەواو بوو و کۆتایی پێهات.

بە رۆیشتنی میوانەکان ناقوسە گەورەکەی شەقامی پاوڵس لە هەوای ئازاد و خاوێندا هەر دەنگی دەدایەوە. مستر لۆری وتی ((شەو باش مستر کارتۆن)).

((شەو باش مستر دارنی. تۆ بڵێی شەوێکی ئاوای دیکە پێکەوە رابورێن؟)).

## - ٦ -

# پێکدادانێك لەپاریسدا

مارکۆس ئیڤرمۆند کۆشکەکەی پاشای جێهێشت. لە پلەکان ڕۆشتنە خوارەوە بۆ حەوشەکە و لەولا سواری گالسکەی خۆی بوو بۆی دەرباز بوو. لە بارودۆخێکی نالەباردا بوو هیچ کەس لە ناو کۆشکەکەی پاشادا لەگەڵی نەدەدوا تەنانەت پاشایش ئاوڕی لێنەدەدایەوە.

لە دۆخێکی ئاوادا پەسەند وایە چاوێك بگێڕی بەو خەڵکە پرژ و بڵاوەی کە لەترسی ئەوەی نەك بێ بە ژێر گاری و ئەسپەکانەوە چۆن ڕایاندەکرد. نۆکەرەکەی وەك لەگەڵ دوژمنێك تێگیرابێ هەر دەیخوڕیە ئەسپەکان ئاغاکەش هیچ هەوڵی بۆ پاراستنی خەڵك نەئەدا. ناڕەزایەتییەکی زۆر بەرامبەر بە گاریچییە نۆکەرە تورەکە کرا، بەڵام هیچ نەکرا خەڵکە هەژارەکە وازیانهێنا. هەر کەس ئەیتوانی هەوڵی خۆ دەرباز کردنی بدا.

گاریەکە هەر هێرشی دەکردە سەر خەڵکەکە بە پەلە بە ناو شەقامەکەدا لەم لا بۆ ئەو لا دەڕۆیشت هێرشی دەکردە سەر ئەو شوێنەی کە ژن و منداڵەکان دەترسان و دەیانقیژان لە ترساندا. لەکۆتاییدا لە کونجێکی شەقامەکەدا لە پاڵ کانییەکدا یەکێك لە تایەکانی گاریەکە دەرپەڕی و منداڵێکی کرد بە ژێرەوە و ئیتر گاریەکە راوەستا. مارکۆس کە لەدەلاقەی گاریەکەوە ملی کێشابووە دەرەوە وتی ((ئەوە کێ بوو ئەو غەڵەتەی کرد)).

پیاوێکی باڵابەرز تەرمە بچکۆڵەکەی منداڵەکەی لە ژێر گاریەکە دا کێشایە دەرەوە لە پاڵ چاوگەی کانییەکەدا رایکێشا و بەسەریدا دەنگی هەڵدا و دەستیکرد بە گریان.

یەکێك لە حازربووان وتی ((ببوورە گەورەم مانسیۆر مارکۆس. ئەوە منداڵ بوو

کردتان بەژێرەوە)).

((ئەی بۆچی ئاوا بە شێوەیەکی ترسناك دەنگ بەرز دەکاتەوە؟ بۆچی مەگەر منداڵی خۆیەتی؟)).

((بەڵێ. گەورەم مانسیۆر مارکۆس ئەوە منالّی خۆیەتی)).

پیاوە بالآبەرزەکە لە ناکاو هەستایە سەرپێ و بە راکردن رووی کردە گاریەکە مارکۆسیش خێرا دەستی برد بۆ شمشێرەکەی.

هەر دوو دەستی بەرزۆ کرد بۆ سەر سەری خۆی هاواریکرد ((کوژرا.. مرد)).

خەڵکەکەش بەو دەورەدا خڕ بوونەوە روویانکردە مارکۆس. هیچیان پێنەوت، بەڵام بە نگایەکی رقاوی و توڕەییەوە چاویان لێ زەق کردەوە.

مارکۆس سەیری هەموویانی کرد کە وەك مشکی خۆڵاوی لە کون هاتبوونە دەرەوە و جانتای پارەکەی هێنایە دەرەوە.

وتی: ((ئەمە بەلای منەوە زۆر زۆر سەیرە کە ئێوە ناتوانن ئاگاتان لە خۆتان و منداڵەکانتان بێت ئێوە دایم سەر رێگەکان دەگرن. من چۆن بزانم کە ئێوە ئازاری ئەسپەکانی منتان نەدابێت؟ وەرە، ئەوەیان بدەرێ)).

سکەیەکی زێڕینی بۆ فڕێدا کە هەموو کەس ئاگایان لە فڕێدانی پارەکە بوو. پیاوە بالآبەرزەکە دیسان هاواری کرد: ((مرد..!)).

کۆمەڵە خەڵکەکە دابەشبوون رێگەیان بۆ پیاوێکی تر چۆڵکرد. بە دیتنی ئەو، پیاوە بالآبەرزە کە باوەشی کرد بە ملیا و دەستیکرد بە فرمێسك دارِشتن. ئیشارەتی کرد بۆ ئەو ئافرەتانەی کە داباریبوون بە سەر تەرمی بچکۆلەکەدا و بەهێمنی دەجووڵان بەڵام ئەوانیش هەر وەك پیاوەکان بێدەنگ بوون.

ئەم پیاوە کە تازە هاتبوو وتی: ((گاسپرد من رووداوەکەم بە چاوی خۆم دیت. هەموو شتێك دەزانم. تۆخۆڕاگر بە. تۆ چوزانی لەوانەیە مردنی باشتر بووبێت لە ژیان. ئەو لە یەك چرکەدا گیانی لەدەستدا، بەبێ ئەوەی ئازار بچێژێ. خۆ نەیدەتوانی بەبێ ئازار و ئەشکەنجە بژی؟)).

مارکۆس بانگیکرد: ((هۆی تۆ لەوێ. تۆ پیاوێکی ژیر و تێگەیشتوویت ئەوانە

چیت بانگدەکەن؟)).

((ئەوان پێمدەڵێن دیفارج)).

((ئیش و کارت چییە؟)).

((پیاوێکی عارەق فروشم)).

مارکۆس سکەیەکی زێڕینیتری فڕێدا و وتی: ((هەڵیگرە پیاوی عاقڵ و عارەق فروش. چۆن حەز دەکەیت وا خەرجی کە. ئەو ئەسپانە ئازاریان نەگەیشتووە؟)).

مانسیۆر مارکۆس بەبێ شپرزی سەیری خەڵکەکەی کردەوە پاڵیدا بە کورسییەکەوە خەریك بوو گاریەکەی لێبخوڕێت. هەر وەك پیاوێکی ئاغاوات فیزی دەکرد وەك ئەمە یەکەم جار بێت کە رێکەوت کۆمەڵێ خەڵکی تێکدابێ تاوانەکەی رشت. لە ناکاو خڕەی سکەیەکی ئاڵتونی رای دەگرێ کە دەکەوێتە بەر پێی لە ناو گاریەکەدا.

مارکۆس وتی: ((راوەستە ئەسپەکان راگرە ئەوە کێ بوو ئەو پارەیە فڕێدا ؟!)).

سەیری ئەو شوێنەی کرد کە دیفارج راوەستابوو بەڵام ئیتر بالابەرزێك لەوێ نەمابوو لە شوێنەکەی ئەودا زەبەلاحێ رەش و زلە راوەستابوو.

مارکۆس بەبێ ئەوەی دەنگ بەرز بکاتەوە بە هێمنی وتی: ((ئێوە سەگەکان بە مەیلی خۆم ئارەزووی هەر کامتان کەم سوارتان دەبم. ئەگەر ئەمزانی کام سەگتان بوو لێرەدا ئەمخستە ژێر تایەی گاریەکەم)).

ئەوانیش وەك کۆیلە بوون لە دەستدرێژیکەر دەترسان نەك یەکێك لە پیاوەکانی هێرش بکاتە سەریان یاخود چاویان لێ زەق کاتەوە. بەڵام ئەو ئافرەتەی کە راوەستا بوو خەریکی دروومان بوو چاوی بڕیە مارکۆس و بەنیگایەکی قووڵ و رقاوییەوە سەیریکرد.

ئەویش وای بە باشتر زانی کە هەر گوێنەدات. جا پاڵیدا بەکورسییەکەوە دەنگی کرد لە گارچییەکە وتی ((لیٚخوڕە)).

رۆیشت و رۆیشت بەناو شەقامەکانی (پاریس) شاری نەهامەتی و ماتەمیدا تێپەڕی کرد. بەرەو دەرکی کراوە کەوتەڕێ. گارییەکە بە پاڵ دیمەنە جوانەکانی

لادێکاندا دەڕۆیشت کە خەرمانەکان لە دەشتەکان و کێڵگەکاندا لاواز و کەمبوون لاوازتر لەوەرزێرەکان و کرێکارە هەژار و ماندووەکان بەردەوام وا باوەڕ دەکرا کە کێڵگەکان نەهامەتی و قوڕبە سەرییان بە سەر خەڵکدا دابەشکردبوو.

گارییەکە هەروەها بە هێمنی بەرەو گردۆڵەکان بەرەو ئاسۆ دەڕویشت. ڕێگە چاککەرێك لەو کاتەدا بە چاوێکی سەرسوڕماوانەوە سەیری ئەوی کرد کە دای بە پاڵیا و تێپەڕی کرد. پاشان رایکرد بۆ سەر تەپۆڵکەکە و چاوی تێبڕی. لەولا گارییەکە لە تەپۆڵکەکە چووە خوارەوە بۆ ناو ئاواییە هەژارەکە. هەموو لادێیە هەژارەکان لە بەر دەرکی ماڵەکەی خۆیان دانیشتبوون چاوەڕوانی خواردنە سووکەکەی ئێوارەیان دەکرد، هەندێ منالێ دەبینران کە سەگیان پێ نەبوو.

باجێکی زۆر زۆربەی خەڵکی ئەو لادێیەی کوشتبوو باج بۆ نیشتمان باج بۆ کلێسە، باج بۆ کێڵگە، باجی گشتی ئەمانە هەموو ئەو خەڵکەیان ئازار دەدا کە لەو دێیەدا مابوونەوە.

گارییەکە بە ناو ئاواییدا خولی دەخوارد. وەرزێڕەکان هەموویان ماق مابوون سەیری ئەویان دەکرد ئەویش سەیری ئەوانی دەکرد. کابرای ڕێگە چاککەر لەتەپۆڵکەکە هاتە خوارەوە.

مارکۆس بە گاریچییەکەی وت: ((ئەو کابرایەم بۆ بێنە)). کابراکەیان هێنا.

((من بە پاڵتا تێپەڕم کرد لە ڕێگەدا)).

((بەڵێ گەورەم. من خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە تۆ بە پاڵما تێپەڕت کردووە)).

((من بە پاڵتا دەرچوم، هەروەها دووبارە لە سەر لوتکەکەشدا. باشە بۆچی تۆ ئەوەندە بە سەر سوڕمانەوە سەیری گاریەکەت دەکرد؟)).

((گەورەم، من سەیری ئەو پیاوەم دەکرد پیاوێك لەژێر گاریەکە دابوو. ئەو خۆیی بە زنجیرەکەدا هەڵواسیبوو)).

((کێ بوو؟ تۆ هەر چی کەس لەم دەورەدایە دەیناسی. کێ بوو؟)).

((ببوورە گەورەم. ئەو خەڵکی ئەم دەورە نەبوو. ئەو غەریب بوو. قەت ئەوم پێشتر نەدیوە)).

((لە کێ ئەچوو؟)).

((گەورەم ئەو بە تەپ و تۆزداپۆشرابوو. وەك تارماییەکی سپی وا بوو. تارماییەکی رەقەڵە بوو؟)).

((ئەی چی بە سەر هات؟ رایکرد؟)).

((گەورەم، لە تەپۆڵکەکە دەرچووە خوارەوە. شەیتانێکیش لە دوای بوو؟)).

مانسیۆر وتی: ((چەنێ بێ عەقڵ بوون! لەوانەیە ئەوە دز بووبێت ئێوەش هیچتان نەوت. دوورکەوە. مانسیۆر گابڵ)).

گابڵ نوێنەری مانسیۆر مارکۆس بوو. ئەو باج و مزە و کرێ و شتیتری بۆ مارکۆس کۆ دەکردەوە.

((گابل ئەگەر ئەم پیاوە هات بۆ ئاوایی خێرا دەست بە سەریکە)).

((مانسیۆر، من زۆر پێ خۆشحاڵم بە بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانت)).

مارکۆسی وتی: ((دەی بەردەوام بە)).

کاتێك کە مارکۆس گەیشتە چاتیۆو (قەڵایەکە) دنیا تەواو تاریك ببوو.

نۆکەرەکان چرا بەدەست هاتن بۆ بەخێر هاتنی و چاوپێکەوتنی ئەو دەروازەگەورە کە کرایەوە.

((تۆ بڵێی چارلزی برازام تا ئێستا گەیشتبێتە ئێرە لە لەندەنەوە؟)).

((نە مانسیۆر هێشتا نەگەیشتووە)).

## - ٧ -

# داڕنی و مامەی مارکۆس

مارکۆس بە سەر پلەکانە دارینەکاندا سەرکەوت بۆ ناو قەڵاکە. چراوك بەدەست کەوتبووە پێشەوە. هەیوانە گەورەکەی جێهێشت و سەرکەوت بۆ ناو سێ هۆدە تایبەتەکەی خۆی کە لە ژووری سێیەمدا مێزێکی گەورەی دووکەسی بۆ خواردنی نانی ئێوارەی تێدا بوو.

وتی: ((خۆ وەك دەبیستم برازاکەم هێشتا نەگەیشتووە ئیتر گومان ناکەم هەر ئەمشەو بێت.مێزەکە لێی گەڕێن با هەر وا بێت. من تا چارەکە کاتژمێرێکی تر خۆم ئامادە دەکەم)).

لەم کاتەدا کە ئەو خەریکی خواردنی نانی شەو بوو. دەنگی تایەی هاتە گوێی. ئەو دەستوریدا کە برازاکەی دەڵێ با تا نانی شەو چاوەڕوانی بن.

لە ماوەیەکی کورتدا برازاکەی هاتە ژوورەوە. ئەو بە چارلز داڕنی لە ئینگلتەرادا ناوبانگی دەرکردبوو.

داڕنی لەکاتێکدا کە خەریکی جێگەگرتن بوو وتی: ((گەورەم تۆ دوێنێ پاریست بەجێ هیشت؟)).

((دوێنێ، ئەی تۆ؟)).

((من یەکەو راست کە لەندەنەوە هاتووم)).

((ماوەیەکی زۆرە دوور کەوتویتەوە)).

((سەرقاڵ بووم بە هەندێ ئیش و کاری جۆراوجۆر)).

مامەی وتی: ((بێگومان وایە)).

((کاتێك کە لە رێی بووم کەوتمە ناو مەترسییەکی گەورەوە. لێم شێواوە کە بۆ لەو بارودۆخەدا کە بەدەوری مندا خولی دەخواردەوە تۆ بۆ ئەتویست روخسارێکی زیاتری

بەدگومانی دروستبکەیت)).

مامەی بە زەردەخەنەوە وتی: ((نە، نە، نە)).

برازا بە بەدگومانییەوە سەیری مارکۆسی کرد ((خۆ ئەزانم ئەگەر بتوانیبایە منت رادەگرت. لە راستیدا من زۆر پێ‌خۆشحاڵم بەوەی کە تۆ لەدادگاکەدا لایەنگرت نییە. بۆیە ئەگەر دەسەڵاتت بوایە ئەوا منت لە زیندان دەنا)).

مامەی وتی: ((دەگونجا لە بەر سەربەرزی عەشیرەت وامدەکرد)).

((بە راستی خۆش بەحاڵی خۆم کە تۆ دیسان جوابەکەت بە ساردی وەرگرت)).

مامەی وتی: ((بەداخەوە ئەبێ بڵێم لەم رۆژگارەدا بۆعەشیرەتێکی گەورەش هاورێیەکی بچووك دەسناکەوێت. هەموویان بەپارەی زۆر فرۆشراون، لەم بارەوە نەدەبوو ئاوا بێت بەڵام لە هەموو شتێکدا فەرەنسە بە هیچ دەردەچێ. باو و باپیری ئێمە دەسەڵاتی ژیان و مەرگیان بوو بە سەر ئەو خەڵکەی لەدەوریاندا دەژیان بەڵام ئێمە هەموو مافێکمان لە دەسداوە. زۆر خراپ هەر زۆر)).

برازاکە وەڵامی دایەوە: ((مامە ئێمە ئێستا و رابوردووش رەفتارمان لەگەڵ خەڵك خراپ بووە. بۆیە من بڕوام وایە لە هەموو بنەماڵەکانی‌تری فەرەنسە زۆرتر جێگەی رقین بۆ خەڵك)).

((دەلێیگەڕێ با وابێ هەر نیشانەی رێز و ئیحترامین)).

((ئەو رێز و ئیحترامەی کە ئێستا من دەزانم بەس هێنی ترس و نۆکەرییە. من قەت ئەو سیستەمەی کە باوکم (براکەت) جێی هێشتووە بۆم قەبووڵێناکەم. من بەشێکم لەو سیستەمە بەڵام بێدەسەڵاتم. تێدەکۆشم بۆ دابینکردنی داخوازییەکانی ئەو بێدایکانەی کە من هەر دەبێ رێزیان لێبگرم. ئەمەوێ ئەو غەڵەتانەی کە پێشتر کراون چارەسەریان بکەم)).

((ئەگەر داوای یارمەتیم لێبکەیت داواکەت بێکەڵکە)).

چارلز وتی: ((ئەمە خۆی تایبەتمەندییەکە و فەرەنسەش منی لەدەستداوە، من ژیانیان پێدەبەخشم و زیندوویان دەکەمەوە)).

((ئەمە هێشتا تایبەتمەندی تۆ نییە)).

((ئەگەر سبەینێ رۆژم لێبووەوە. ئەبێ پەسەندی نەکەم)).

((هیوا و بڕوام وایەکە شتی وا نابێت)).

((ئەمە کۆشکێکە لە بەدبەختی و ماڵوێرانی. قەڵای سەرکزی و نەدارییە. بێ سەر و گەورەیە. شك و گومان دڵپیسی و برسیەتی و رەنجکێشان)).

مارکۆس بە رواڵەتێکی خۆشەوە وتی: ((ئەها! ئەگەر ئەوە بوو بە راست من ئـەبێ مەجال بدەم بەو کەسەی کە باری قورسی وەزعەکە وەر ئەگرێت)).

مامەی وتی: ((وە تۆش چۆن دەت هەوێ بژیت؟)).

((من ئەبێ کار بکەم)).

((لە ئینگلتەرا وا بزانم؟)).

((بەڵێ. لەوێ ناوبانگی بنەماڵە هیچ چەشنە ئازارێك لە من نابینێت)).

مارکۆس پرسیاری کرد: ((تۆپیاوێکی فەرەنسی دەناسی کە لەوێ بێوەی بوبێت؟)).

((بەڵێ)).

((دکتۆرێك لەگەڵ کچەکەی)).

((بەڵێ)).

مارکۆس وتی: ((بەڵێ. تۆش ماندوو بوویت شەو باش)).

لەو کاتەدا کە ئەو سەری رێزی دادەنەوانـد بـۆ شـەو بـاش لـە نگاکەیـدا شـتێکی دەشاردەوە کە رازێکی نهـێنی بـوو کـە ئـەو نهێنییـە بـە توانـاوە دژایـەتی برازاکـەی دەکرد. بەڵام ئەو دەشیزانی کە پرسیارکردن لەم بارەوە لە مامەی بێ کەڵکە)).

مامەی وتی: ((شەوباش خەونی خۆشت بێت! ئـادەی مانـسیۆر برازاکـەم رێنمـونی بکە بۆ هۆدەکەی خۆی...)).

بە نەرم و نیانی لە ژێر لچەوە وتی بە خۆی: ((ئـەرێ ئەگـەر حـەزت کـرد لـە سـەر جێگەدا بیسوتێنە)).

لە پاش ئەوەی کە برازاکەی چووە سەر جێگەکەی بـۆ خـەوتن. مارکۆسـیش خـۆی چووە ناو هۆدەکەی خۆی. شەوەزەنگ بـە تـەواوی خانووەکـەی داپۆشـی هـەروەها کـە دەورو پشتی وڵاتی داگیر کرد. برسی لە داڵغەی خواردنی خۆشدا. بەپەرۆش بوو بۆجل

و بەرگی جوان و ئاسایش. پاشان لەو کاتەیدا کە تیشکی هەتاو دای لـە کۆشـکەکە و دارستان و کێڵگەی ئاواییەکەی رووناککردەوە سەرەتای رۆژی سـبەی دەسـتی پێکـرد. پیاوان و ژنانی ئاوایی سەر لەبەیانی سـارد و سـۆڵە بـۆ دەسـتپێکردنی ئـیش و کـاری خۆیـان هاتنـە دەرەوە. هەنـدێکیان بـۆ جـووت کردنـی مـەزراکانیان و هەندێکیـشان گاکانیان دەدایـە بـەر بـۆ ئـاودان و لەوەڕانـدن لـەو ئاڵفـەی لـە گـوێ ڕێگەکانـدا شـین بووبوون.

کۆشـکەکە دێرتـر خـۆری لێـدەهات. دەلاقـەکان کـراوە بـوون. لـە بـەر تیـشکی رووناکیدا ئەسپەکان لە دەرگای هاتنـە ژوورەوەدا دیـار بـوون کـە سـەر شـانی خۆیـان دەلێـسایەوە. سـەگەکانیش چـەناگەیان نـابووە سـەر دەسـتیان و پـاش کـەوتبوون بـۆ مەجالی گەڕان بێئارام بوون. ئەمانە هـەموو ئـەو شـتە ئاسـاییانە بـوون کـە هـەموو بەیانیان رووی ئەدا. بەڵام ئەی زەنگـی کۆشـکەکە بـۆچ دەنگـی دەهـات؟ بۆچـی ئـەو پیاوانە لە شەقامەکەدا سەرەوخواریان دەکـرد؟ ئـەی بـۆ ئـەوانی تـریش ئەسـپەکانیان دەرەتان و سواریان دەبوون و بە گەڕەکەکـەدا غاریـان دەکـرد؟ ئـەی هـۆی ئـەو پەلـەو تورەییە چ بوو؟

هۆی ئەو هەموو نائارامییە لە سەر جێگەکەی مارکۆسدا دەدۆزێتەوە.

بە سەر رەسمـی دڵێکـەوە کـە لەگـەڵ چـەقۆیەکدا لـە سـەر جێگەکـەی مارکۆسـدا دانرابـوو لاپەڕەیـەك پێـچرا بـوو بـە مـشتۆی چـەقۆکەدا کـە ئـەم چـەند وشـەی پێـوە نووسرابوو. ((بە پەلە بۆ سەر قەبرانی لێی خوڕن. لە لایەن جاکیۆسەوە)).

## - ٨ -

# دارِنی دەربارەی خۆشەویستییەوە دەدوێت

دوانزده مـانگ رابـورد. دارِنـیش وەك مامۆسـتایەکی زمـان و ئـەدەبی فەرەنـسی خەریکی فێرکردن بوو. زۆربەی کات لە((کـامبریج)) بـوو. ئـەو شـوێنەی کـە ئـەو وەك مامۆستایەکی زۆر باش بۆ ئەو خوێندکارانەی زاراوەی مۆدێرنیان دەخوێنـد ناوبـانگی دەرکرد. بۆ حەوانەوەش دەچووە لەندەن.

هەرزەکار و ئەویندار بوو. لەو رۆژە خەتەرەوە کە لویس مانێتی دیتبوو خۆشیدەویست. قەت دەنگێکی ئاوا زەلاڵ و خۆشی نەبیستبوو قەت روومەتی ئاوا جوان و شیرینی نەدیتبوو لەو کاتەوە کە ئەو فەرەنسەی جێ هێشتبوو ساڵی تێپەڕی کردبوو بیرەوەری کوشتنی مامەی و رووداوی قەڵای ((چاتێوۆ)) وەك کارەساتێك هەر لە مێشکیدا هات و چۆی دەکرد. لە بارەی خۆشەویستی خۆیەوە لەگەڵ کەس نەدوابوو.

رۆژیش رۆژێکی هەتاوییە و هاوینـە ئـەویش تـازە لـە ((کـامبریج)) هاتۆتـەوە بـە تەمایە لە بارەی خۆشەویستییەکەیەوە لەگەڵ دکتۆر مانێت بدوێت. بە سـەر رێـوە بـۆ ماڵی ئەوان ئاگاداریش بوو کە لەگەڵ خاتوو پرووس لە دەرەوەیە.

لە دەلاقەیەکەوە دکتۆر مانێتی دیت کە بە سەر کورسییەکەوە پاڵکەوتبوو. وزەیەك کە لە رۆژانی سەخت و ئازارکێشاندا ئەوی یارمەتیدەدا، ئێستا بووە بە ورەیەکی بەرز و بۆ لەشی ئەو گەڕاوەتەوە. ئەو ئێستا لە ورە و لە لەشدا بەهێزە. خوێندنەوەی زۆرە و کاری دەرمانیشی دەست پێکردۆتەوە. بەردەوام شادمانە و لە رابوردوویەکی زۆر زۆر بە سەر چوەوە هەورێکی ماتەم بەسەر رووناکییەکانی بیر و رایەوە دەبینی.

کاتێك کە دارِنی هاتە ژوورەوە خوێندنەوەکەی دەست لـێ بـەردا و لـە پـاڵ خۆیـدا داینا.

دکتۆر وتی: ((چارلز دارِنی بە دیتنت دڵشاد دەبمەوە. بۆ مـاوەی چـەند رۆژێـك لـە دالغەی تۆدا بووین. دوێنێ مستر سترایڤر و مستر کارتۆن لێرە بـوون ئـەوانیش وتیـان

تۆ وەك شێوەی ئاسایی درەنگ دێیت)).

دارِنی بە بیستنی ئەوەی کە ئەو دوانە لەو ماڵەدا بوون زۆر پـێخۆشـحاڵ نـەبوو. هەواڵی ساغ و سەلامەتی خاتوو مانێتی پرسی.

((باشـــە، ســـەلامەتە لەگـــەڵ خـــاتوو (پـــرووس)دا چـــۆتە دەرەوە بـــەم زووانـــە دەگەڕێتەوە)).

((دکتۆر مانێت من ئەزانم کە لە دەرەوەیە. بۆیە کەڵکم لە هـەل وەرگـرت و داوات لێدەکەم لەگەڵت بدوێم)).

لێرەدا وەستانێك بوو.

دکتۆر بە دەنگی گومان لێکراوە وتی: ((بەڵێ)).

((کورسییەکەت بێنە و دەستپێبکە)).

((لە ماوەی هەژدە مانگەی رابورووداا شادمانییەك کە هەستم پێکردووە ئەوە بووە کە لە سەردانە بەردەوامەکانمدا بۆ ماڵی ئێوە پێی خۆشحاڵ بووم. هیواشم ئەمەیە کـە ئەو شتەی کە باسی لە سەر دەکەم لە داهاتوودا ...)).

((باسەکە باسی لویسە؟)).

((ئەوەیە، دکتۆر مانێتی خۆشەویست. بە دیـتنی یەکـەم جـاری کـچەکەت خۆشـم دەوێ خۆشەویـستییەکی قـووڵ و بـەڕێزەوە. ئەگـەر خۆشەویـستییەکیتر هـەبێت لـەم جیهانەدا. بەس تەنها ئەوم خۆشدەوێت. تۆش بۆ خۆت خۆشەویستێکت هەبووە بـەڵێن بدە با خۆشەویستییە کۆنەکەت باسی من بکات)).

دکتۆر رووی کرد بەولاوە و نیگای دوور خستەوە. وتەکانی دارِنـی بـیری برینێکـی قووڵی لە لەشی مانێتدا نوێکردەوە وهێنایە بەر چاوی.

((تکات لێدەکەم گەورەم. باسی ئەوە مەکە! دەربارەی ئەوە مەدوێ)).

گریانەکەی وەك گریانی کەسەرێکی کۆن بـوو. دەسـتەکانی داگـرت بـۆ دارِنـی بـۆ ئەوەی داوای لێبکات کە بێدەنگ بێت. بۆ ماوەیەك دارِنی راوەستا.

دکتۆر بەدەنگی کزەوە وتی: ((داوای لێبوردن دەکەم. من گومانم لە خۆشەویستی تۆ بۆ لویس نییە. ئەی خۆت هیچت لەگەڵ خۆتدا درکاندووە؟)).

((نە گەورەم  تەنانەت بۆشم نەنووسیوە.تۆ ئەزانی من بۆچی هەستمکرد بەوەی کە کچەکەت تا چ رادەیەك بۆ تۆ پێویستە. من ئەزانم لەو کاتەوە کە تۆ خۆتت دیوەتەوە ئەو لە هاوسەرێك چاکتر بووە بۆ تۆ. ئەوەش ئەزانم کە خۆشەویستی ئەو بۆ تۆ و خۆشەویستی تۆش بۆ ئەو گەورەترین شتە بۆ ژیانی هەردووکتان)).

دکتۆر مانێت بێدەنگ دانیشت و سەری دانەوند. هەناسەی سوار بوو بەلاّم هیچ نیشانەیەك لەقووڵی سۆزی هەستی خۆی نەدرکاند.

((بەڕێز دکتۆر مانێت! من دەبینم تا چ رادەیەك ئێوە پێویستیتان بە یەکتر هەیە. بە درێژایی ئەو رادەیەی کە توانیومە منیش خۆم بۆ ئەو مەبەستە دابینکردووە. بەلاّم هەر خۆشمدەوێ. بەرزی ئاسمانەکان شایەتی خۆشەویستی منە)).

باوکی بە نیگەرانییەوە وەلاّمی دایەوە ((بڕوا دەکەم)).

((لەوە مەترسە کە داخۆ بە هێنانی لویس بۆ ژیانی خۆم بە گوێرەی خۆم خۆشبەخت ببم. بۆیەش بۆ خۆم جێی پرسیار دەبێت لە بەر ئەوەی لە نێوان تۆ و لویسدا جیاوازییەك دروستبکەم. ئێستاش مەبەستم ئەوە نییە و قەت شتی واش نابێت)).

دەستی خستە سەر شانی دکتۆر ((نە گەورەم. منیش وەك تۆ لە فەرەنسەوە بە بەدبەختی و نایاسایی سوار کراوم بۆ ئێرە. منیش وەك تۆ دەمەوێ ژیانی خۆم لە ولاّتی بێگانەدا بدۆزمەوە. من بەس داواکارم چارەنووسی خۆتم لەگەڵدا بەشکەیت. هیوا و حەز و ژیانتم لەگەڵدا بەشکەیت. بۆ ئەوەی تا مەرگ وەفادارت بم. تکاشم ئەوەیە کە نەبمە دروستکەری جیاوازی لە نێوان تۆ و لویسدا بەڵکو ژیانم تێکەڵ بە ژیانتان دەکەم)).

باوك سەری بەرز کردەوە. کێشەیەك لەمێشکیدا هاتوچۆی دەکرد. هەندێ بیرەوەری تاڵ و ترشی لە راوڵەتی دارنیدا خۆی نیشاندەدا. کە دەکەوتنە یادی ئەو بیرەوەریە تالاّنەی کە ئەو هەر هەوڵی دەدا لەیادیان باتەوە.

((چارلز دارنی، تۆ لە خۆ بردوانە و پیاوانە قسە دەکەیت. بۆیە سوپاست دەکەم.منیش هەوڵدەدەم ئازادانە لەگەڵت بدوێم. تۆ دەلیلێکت بە دەستەوەیە کە

لویس ئالآوەتە خۆشەویستی تۆ؟)).

((نازانم. تا ئێستا نازانم)).

((تۆ تکام لێدەکەی کە لەگەڵ لویسدا لەم بارەوە بدوێم؟)).

((نە گەورەم. ئێستا نە)).

((ئەی بە هیوای من چیت بۆ بکەم؟)).

((بەس تۆ بەڵێنی ئەوەم پێبدە کە ئەگەر لویس لەبارەی خۆشەویستی منەوە لەگەڵ تۆدا قسەیکرد. تۆ بەدژی من هیچ نەڵێیت. بەس هەر ئەوە بڵێ کەمن پێم گوتیت. دەشزانم ئەگەر ئەو هەستبکات لە نێوان خۆشەویستی تۆدا جیاوازی دروستدەکات. ئەوا قەت من پەسەند ناکات)).

دکتۆر وتی: ((بەڵێن دەدەم ئەگەر هەر کاتێك ئەو نیشانیدا کە تۆ بۆ ژیانی ئەو پێویستی، ئەوا منیش دەتدەمێ. هیچ شتێکیش بەرگری لەوە ناکات. تەنانەت بیرەوەری سالآنی رابوردویشم و هەر وەها ئەو غەڵەتانەی کە کردوومە)).

((سوپاس بڕۆا و متمانەی تۆبە من ئەبێ ببێتە بڕوا و متمانەیەکی پتەوتر وەرگەڕێتەوە بۆ خۆت لە لایەنی منەوە. ناوی ئێستای من ئەگەر چی بە سووکی لە ناوی دایکم گەڕاوەتەوە بەلآم ئەوەش نییە کە بە ئاشکرایی من بە تۆم وتووە، بە هیوام ناوی راستەقینەی خۆمت پێ بڵێم. پێشت دەڵێم کە بۆچی لە ئینگلتەرادام)).

دوکتۆر وتی: ((راوەستە!)).

((بە هیوام پێت بڵێم لەوانەیە من شیاوی ئەو بڕوا و متمانەی تۆبم و شتی شاراوەم لەگەڵ تۆ دا نەبێت)).

((راوەستە حەز ناکەم ببیسم و گوێگرم. هەر کاتێك کە داوام لێکردیت ئەو جار ئەو شتانەم بۆ شیدەکەیەوە. ئەگەر سەر کەوتیت یاخۆ لویس حەزی لێکردیت. ئەتوانی سەر لە بەیانی ئەو رۆژەی کە زەماوەندەکە دەکەیت پێم بڵێیت. پەسەندی دەکەیت؟)).

((بە حەزەوە)).

((دەستت بدە دەستمەوە. بەم زووانە ئەو (لویس) دەگەڕێتەوە. باشتر وایە ئەم شەو

من و تۆ پێکەوە نەبینێت. برۆ! خوات لەگەڵ!)).

کاتێك کە دارنی ئەوی جێهێشت تاریکی کردبوو. شتێ دوای ئەوە لویس هاتەوە. بەپەلە خۆی کرد بە ژووردا. سەری لەخاتوو پرووس دا ئەویش لە سەرەوەی پلەکان بوو بەدیتنی کورسییە خاڵییەکە سەری زۆر سوور مابوو.

هاواریکرد: ((باوکە، لەکوێیت)).

هیچ وەڵامێکی لێ نەبیست بەڵام هەر گوێی لە برتەیەك بوو لە سەر جێگەکەیەوە.

بە پەلە بەرەو ئەوێ رۆیشت سەیریکرد بە ترسەوە هاتە دواوە بە کوڵ لە ترسێکی زۆردا دەستی کردە گریان. ((من چی بکەم؟ من چم لە دەست دێت؟)).

نەبە کامی و بێ بڕوایی پاش چەند دەقەیەك لێی دوور کەوتەوە. گەڕایەوە بۆ هۆدەکەی دوکتۆر. بە هێمنی تەقەیدا لە دەرگاکە و بەنەرمی بانگی لێکرد. برتە و بۆڵەی دکتۆر بە تەقەی دەرگاکەوە تەواو بوو. خێراش هاتە دەرەوە بۆ لای لویس و بۆ ماوەیەکی زۆر پێکەوە پیاسە و خوار و ژووریان کرد. بەبێدەنگی و بە رەحەتی بۆ دوکتۆر هەر قسەیدەکرد.

بە درێژایی ئەو شەوە هەر کچەکە بێدەنگ هەڵدەستا و سەیری باوکی دەکرد بە خەوتوویی. خەونی قورس بوو کەرەسەی پینەچیەتییەکەی و جلی کارەکەی وەك خۆی مابوو. کچەکە هەناسەییەکی رەحەتی دەکێشا و بە سوپاسەوە دەگەڕایەوە بۆ جێگەی خۆی.

## - ٩ -

# کارتۆنیش هەر ئەوە دەکات

هەر ئەو شەوە یان سەر لە بەیانی زوو مستر سترایڤر وتی:))سایدنی، پێکێکی دیکەم بۆ تێکەڵ کە برێ قسەم هەیە بۆت!)).

بۆ ماوەی چەند رۆژێك سایدنی سەرقاڵی پاك و خاوێن کردنی بەڵگەنامەکانی سترایڤر بوو. بۆ ئەوە دادگاکان داخراون و تا نۆڤامبر هیچ دادگایەك نابێت. لەکۆتاییدا کارەکان کۆتاییان پێهات. بەڵام بە هیلاکییەکی زۆرەوە.

سترایڤر وتی: ((ئێستا بڕوانە! ئەمەوێ هەندێ شتت پێ بڵێم کە لات سەر سورهێنەرە. ئەویش ئەوەیە. ئەمەوێ ژن بێنم)).

((بە پیرۆزت بێت! ناکرێ بزانم کێیە؟)).

((هەڵی بێنە)).

((من بۆم ناکرێ بەم سەعات پێنجی بەیانییە هەڵی بێنم. یانێ مێشکم رێی پێ نابات)).

((باشە کە وای لێهات، خۆم پێت دەڵێم. ئەگەر توانیم حاڵیتکەم. وەك خۆت ئاگاداریت من لەتۆ خاسترم. یان من ئەو پیاوەم کە زۆر زۆر بە خۆیدا دەگات)).

کارتۆن پێشنیاری کرد: ((بڵێ زۆر سازشکار و لە خۆڕازی)).

((باشە. ئەڵێم زۆر سازشکار. زۆر سازشکار واتە ترسنۆك لە حەنای ژندا. خۆ تۆ زیاتر لە من لە ماڵی دکتۆر مانێتدا بوویت. من لەهەڵس و کەوتی تۆ بەرانبەر بەوان زۆر شەرمم دەکرد. سایدنی تۆ هاوڕێیەکی نەسازیت)).

سایدنی قومێکی هەڵقوڕاند و پێکەنی.

سترایڤر وتی: ((بڕوانە. پیاوی چاك وسەرکەوتوو بە. من بۆ خۆشبەختی ژیان لە تۆ کەمتر پێویستیم بە کەرەسە هەیە. چۆن ئەو کارەش دەکەم؟ لە بەر ئەوەیە کە عەقلی تێدا بە کار دەبەم. من زاڵدەبم بە سەر جیهاندا)).

((باشه، دەی ئەو خانمە کێیە؟)).

((ئەو خانمۆڵە عازەبە خاتوو مانێتە. پەسەندی دەکەیت؟)).

سایدنی وتی: ((چۆن ئەبێ بە دڵم نەبێت؟)).

((بەڵێ سایدنی.تۆچاکتر لەوەی کە من بیرم لێدەکردەوە مەسەلەکەت قۆستەوە، من بەشی خۆم هەیە لەم شێوە بێ ئەوەی کە بۆم بگۆڕدرێت بەرژەوەندیم هەیە. هەست بەو خۆشیەش دەکەم کە بۆ پیاوێك دەگونجێ ماڵێکی هەبێت و هەستبکات کە ئامادەیە بچێتە نێو ئەو ماڵەوە. بەڵام ئەگەر نەیکات. دەشتوانێت لەدوورەوە بە ژیانی تاکەکەسی درێژە بدات. من پێموایە خاتوو مانێت شیاوی من دەبێت. ئەو خەڵکە داهێنەرێکی سەرنجراکێشە. بۆیە خۆمم بۆ ئامادە کردووە. ئەو لە ماوەیەکی کورتدا من لە قاڵبی پیاوێکی دەوڵەمەندا دەبینێتەوە. ئەرێ ئەی چون خۆت تا ئێستا ژنت نەهێناوە؟ ڕۆژێك ئەبێ نەخۆش دەکەویت. پێویستیت بە کەسێك دەبێت کە چاوەدێریت بکات)).

سایدنی وتی: ((بیری لێدەکەمەوە)).

کەواتە مستر سترایڤر بڕیاریدا کە ژن بهێنێت و بیری لێکردەوە کە پشوودانی ئەم هەفتەیە تەرخانبکات بە سەردانی ماڵی خاتوو مانێت و هەست و بیر و بۆچونی خۆی لەم پێوەندییەدا دەربڕ بکات. ڕێگاکەی گرتە بەر کە لە یەکەم قۆناغدا دەبێ سەردانی مستر لۆری بکات لە بەنکی تیلسۆنەکاندا کە ئەو دۆستی بنەماڵەی مانێتە. ڕۆیشت و لەگەڵ ئەودا دەربارەی داهاتووی پرشنگداری بدوێت.

بە دەنگی بەرز وتی: ((سڵاو! چۆنی؟)).

مستر لۆری وەڵامی دایەوە بە دەنگی هێمن و لەسەرخۆ لە بەر ئەوەی کە ئەویش وەك ئەو قسە بکات:

((ئەتوانم چیت بۆ بکەم؟)).

سترایڤر خۆی دا بە سەر مێزەکەدا وتی: ((ئەها! شتێکی گرنگە. ئەمەوێ خۆم لە ژنهێناندا تاقیبکەمەوە. ئەویش لەلای دۆستێکی بچکۆڵەی دێرینی تۆ، خاتوو مانێت)).

بەشك و گومانەوە دەیروانی بە قیافەیدا و دەستی دەهێنا بە چەناگەی خۆیدا و ئاهی کێشا:))ئەها...! خۆشەویستم!)).

سترایڤر دوپاتیکردەوە: ((ئەها! خۆشەویستەکەی من. گەورەم. مەبەستت چی بوو؟)).

((هەڵبەتە مەبەستم دۆستانە بوو. بەڵام بەڕاستی تۆ دەزانی مستر سترایڤر)).(مستر لۆری بێدەنگ بوو سەری راوەشاند).

((گەورەم. مەبەستت چییە؟ بۆچی مەگەر بە کەڵکی من نایەت؟ بۆ دەوڵەمەندیم؟ بۆ مەگەر سەر بەدەرۆ بوینم؟)).

((نە کەس گۆمانی لەوەدا نییە)).

((ئەی کەوای لێهات تۆ لەم کەونەدا مەبەستت لە چییە؟)).

((پاشی! من ... ئەتەوێ ئێستا بۆ ئەوێ بچیێ؟)).

سترایڤر پاڵی نا لە مێزەکەوە وتی: ((راستەوخۆ)).

((کەواتە وا بزانم بۆم ناکرێت)).

((بۆچی؟ هۆیەکەتم بۆ روونکەرەوە)).

((من نامەوێ بڕۆم تا بەڵگەیەکم بەدەستەوە نەبێت بۆ ئەوەی بڕوام بە سەرکەوتن بێت)).

سترایڤر بە توڕەییەوە وتی: ((تەنانەت سێ هۆی باشم بۆ هێناتیتیەوە بۆئەوەی سەرکەوتوو بم)).

((کاتێك ئەڵێم سەرکەوتوو. مەبەستم ئەوەیە بەسەر کاری ئەو کابانەدا سەرکەوتوو بم)).

سترایڤر بە پێکەنینێکی توڕەوە بەدەنگی بەرز وتی: ((دەی بۆ پێم ناڵێی مەڕۆ)).

((ویستم بڵێم ئەگەر لەم کارەدا تووشی هەڵەیەك ببێت نەبێتە هۆی ئازار و نەخۆشیی ئەو، لەوانەشە دکتۆر مانێت بەلایەوە ناسۆر بێت کە راستییەکانت پێ بڵێ. لەوانەیە خاتوو مانێت هەر پێی ناخۆش بێت تەوەرەکە بێنێتە بەر باس. تۆ بە لاتەوە باشتر نییە ئەگەر من تێبکۆشم رێگە چارەیەك بدۆزمەوە کە خۆی بۆ خۆی هەستی پێبکات، پێش ئەوەی تۆراستە و خۆ بچیت بۆلای؟)).

سترایڤر وتی: ((زۆر چاکە! با بزانین سەر لە بەیانیمان بە خێر ئەبێت)).

لە بانکەکە دەرپەڕی. بڕیاریدا کە رێگە چارەیەك بۆ دەرباز بوون لەم بیرۆکە

بدۆزێتەوە ئیدی ئەوەی هیچ لەبیریدا نەبێت.

کاتێك سەر لە ئێوارە مستر لـۆری بـانگیکرد. گومـان دەکـرا سـترایڤر هـەر هـیچ شتێکی لە بیر نەمابوو. مستر لۆری وتی: خەریك بووم بـەرەومالْ دەڕۆیـشتمەوە. مـن بەبیٚ شك وا دەزانم کە لە وت و وێژەکاندا سەر لـە بـەیانی هـەر زۆر راسـتم گوتـووە. باوەڕ ناکەم کە لەم کارەدا لەگەلْ خاتوو مانێت سەرکەوتوو دەبین.

مستر سترایڤر وتی: ((بە داخم بۆیان لێم گەڕیٚ با ئەو شتانەش لە بیر بەینەوە. جا کە ئەوان عەقلْیان پیٚ نەشکا چاکتر وایە منیش خۆم بکێشمە دواوە. پێشتریش ژنانی عازەب بێعەقلْ بوون. خۆ هیچ زەختێك نەکراوە، قەد بەو ئافرەتە عازەبەم نەگوتووە شووم پێبکات. راستت دەویٚ باوەڕ ناکەم قەت داوای شتی واشم کردبێت. سوپاسی تۆش دەکەم لە بەر ئەوەی سەرم ئێشاندی.

مستر لۆری پێش ئەوەی توانیبێتی بۆچوونەکانی ئەو تاقیبکاتەوە سەری لێشێوا و خـۆی لــە دەرەوەی کێــشەکە دیتــەوە و رێگــەی مالْــەوەی گرتــەبــەر لــە کاتێکـدا بەسەرگەردانی بیری لەوە ئەکردەوە کـە ئێـستا سـترایڤر لـە راسـتیدا لـە چ دنیایـەکی راستەقینەی پڕ لەهەستدا دەژی.

لە چاوپێکەوتنی دوایی لەگەلْ سایدنی کارتۆندا مستر سترایڤر پێیوت کە لەبـارەی ژن هێنانەکەیەوە بیری چاکتری لێکردۆتەوە و پاش چەند قسەیەك بـۆ پـشوودان بـەرەو دەڤن شێر هاتە خوارەوە.

هەروەها سایدنی لە لەندەن مایەوە، رۆژێك هەسـتا چـوو بـۆ لای لـویس مانێـت. لەلێدوانیـدا لەگـەلْ ئـەو هەسـتی بـە ئاسـوودەیی نـەدەکرد. لەروانینیـدا بـۆ روالْـەتی سایدنی وتی: ((کارتۆن ئەترسم وەزعت باش نەبیٚ)).

((بەلاْم ئەو ژیانەی کە ئێستا بەڕێوەی ئەبەم ئەوندە خۆش نییە کە سەلامەتم بکات)).

((بمبوورە کە تیشکم خستە سەر ئەوە. ئەی حەیف نییە ژیانێکی باشتر نەبێت؟)).

لـویس بـۆ جـاری دووەم سـەیریکردەوە. زۆر غـەمبار و دلْ نارەحـەت بـوو کـە بـە چاوەکانی کارتۆنـەوە فرمێـسکی دیـت. تەنانـەت لـەدەنگیـشیدا لـەرزۆکی فرمێـسك دەبینرا. لەو کاتەدا کارتۆن وەلاْمی دایەوە.

وتی: ((زۆر داره. ناتوانم لەمە باشتر بم. من ورده ورده دائەچم و نوقم دەبم)). بە دەستەکانی دەم و چاوی خۆی داپۆشی. لویس تا ئێستا ئەوی وا بەنەرمی نەدیبوو. بۆیە بۆ ئەو بەداخەوە بوو.

((تکایە ببورە، خاتوو مانێت. من تووشی هەڵە بووم بۆ ئەوەی کە ئەو شتەی کە لەدڵمدا بوو بە باشی پێت راگەیەنم، گوێت لێبوو؟)).

((مستر کارتۆن ئەگەر بۆ ئەو شتە حەزێك لە دڵتا پێکبێت. ئەوا من خۆشحاڵ دەبم)).

((رەحمەتت لێبێ خاتوو مانێت. لەگوێ راگرتن بۆ من خەمت نەبێت. من وەك جوانە مەرگێك وام. هەموو ژیانی من ئەبوا باشتر بوایە بەڵام ئێستا ئیتر دێرە)).

((نەمسترکارتۆن بەرای من هێشتا داهاتوو لەرێت وەستاوە بۆ پیاچوونەوەی چاکتر هێشتا زووە)).

لویس بە لەخۆبردوویی و بە دەنگێکی لەرزۆکەوە دەدوا.

((ئەگەر واش بوو خاتوو مانێت. کە تۆ رێ کەوێت گەڕێتەوە بۆ ژیانی خۆشەویستی، من تەنها ئەوەم پێدەکرێت تۆ لەگەڵ خۆم بەرەو داچوون ببەم. بەڵام بەباش ئەزانم کە تۆ ناتوانی ئەو هەڵوێستە باشەت بەرانبەر من هەبێت. من بە هیچ کەسیش ناڵێم. من بەش خۆم سوپاسگوزارم کە نابێت)).

((بێجگە لەوانەش، بۆ من ناتوانم رزگارت بکەم مستر کارتۆن؟)).

((نە، بەڵام ئەگەر ماوەیەکی درێژتر گوێ راگری هەموو ئەو کارانەی کە تۆ پێت ناکرێ بۆ من بە ئەنجام گەیشتووە. هیوادارم تۆ بزانی کە تەنیا حەزی رۆحی منی. تیشکی رووناکی تۆ بە سەر باوکت و بە سەر ماڵەکەتاندا خۆی نواندووە و وا بزانم سێبەرەکۆنەکانیشی سڕیوەتەوە. لەو کاتەوە کە دەتناسم لەگەڵ پەژارەیەکدا رووبەڕوو بوومەتەوە کە هەڕەشە لە ژیانی خەیاڵیم دەکات. وا بیرمەدەکردەوە کە تێبکۆشم بۆ دەستپێکردنێکی دی. ئەمانە هەموو داڵغە بوون! بەڵام بە هیوام تێبگەیت کە هۆی ئەمانە تۆیت!)).

((یانی هەرچی شتە تەواو بووە؟ ئاه... نە مستر کارتۆن، هەوڵبدە، دیسان هەوڵبدە!)).

((نە، بێکەڵکە بەس لێمگەڕێ با بیکێشم لە ناوەڕۆکی حەسانەوەی ژیانی پڕ لە دڵەخورپێیدا. ئەو بیرەوەریەی کە دڵم بۆتۆ کردەوە بۆ ئاخرین جار لە جیهاندا. ماوەم پێبدە با بڕوا بکەم. کاتێك یادی ئەمرۆ دەکەمەوە. درۆ داپۆشراوەکانم لای تۆ سەلامەتن و لەگەڵ کەسێکیتردا دابەش نەکراون؟)).

((ئەگەر بەوە هێور دەبیتەوە فەرموو بڵێ)).

((سوپاس. دیسان، خوا بتپارێزێ)).

دەستی ئەوی هێنا بە گۆنا و لێویدا و بەرەو دەرگاکە کەوتە رێ.

کارتۆن وتی: ((ئەبێ قەت ئەو بابەتە بۆ جارێکیتر بیر نەکەمەوە. کاتێ کە مردم ئەبێ بیر بکەمەوە لەو وتانەی کە بۆ خۆم ئاخرین جار لەگەڵ تۆ دوام)).

ئەو بە شێوەیەکی باوەڕ پێ نەکراو بە خۆی داچوو. بە ئاسانی نەئەتوانرا بزانرێت کە تا چەند دوور دەکەوێتەوە. لویس دەگریا ئەو کاتەی کەرادەوەستا و لای دەکردەوە.

کارتۆن وتی: ((مەگری من شیاوی ئەو هەموو گریانە نیم. پاش یەك یان دوو سەعاتی تر ئەبێ لای هاوڕێیەکم بم. من تکایەکی ترم کردووە کەواتە ئەبێ بڕۆم. دەزانم پێویستی بە وتن نییە چونکە لە ڕۆحمەوە سەری هەڵهێناوە. ئەوەش ئەمەیە بۆ تۆ، هەروەها بۆ ئەوانەش کە لای تۆ جێی ڕێزن ئەبێ هەر کارێکیان بکەوێتە من بیکەم. ئەبێ لە پێناوی ئەوانەی کە یارمەتی تۆیان دابێت و تۆیان خۆشدەوێت هەرچی مەترسییە بیگرمە ئەستۆ. دایمە لە یادی ڕۆژانی خۆشحاڵی رابوردووی تۆ دام. ئێستا پیاوێك هەیە کە ژیانی خۆی لە پێناوی ژیانی خۆشەویستێکدا دەبەخشێ)).

بۆ دواجار وتی: ((خواحافیز لەگەڵ هیوای کامەرانی)).

پاشان ئەوی(لویس)ی بەجێهێشت.

## - ١٠ -

# دروستکەری ڕێگە و بان

ماوەی چەند رۆژێك بوو خەڵکی شەقامی ئانتۆینە چاوەڕوانی هەواڵی بەسەرهاتی هاوڕێیەکیان بە ناوی ((گاسپرد)) بوون. ئەو بە دەستی پۆلیس دەستگیرکراوە. رەوانەی لادێیەك کراوە کە چەند جینایەتی تێدا خولقاوە. ئەوان چاوەڕوانی مانسیۆر دیفارج بوون هەواڵێکیان بۆ بهێنێ. زۆربەیان لە ناو دوکانی شەڕاب فرۆشەکە بە درێژیایی سەعات چاوەڕوان بوون، خاتوو دیفارجیش بێدەنگ دانیشتبوو خەریکی شت رستن بوو.

سەرەنجام، لە دەوری نیوەرۆژدا دوو هەیکەلی تەپ و تۆزاوی بە ناو بازاڕدا تێپەڕیان کرد. یەکێکیان خاوەنی دوکانی شەرابفرۆشەکە بوو ئەویتریان دروستکەری رێگەوبان بوو کە کڵێتەیەکی شینی لەسەردا بوو. کەسیش لەگەڵیان نەدوا لە کاتی هاتنە ژوورەوەیاندا بۆ نێو دوکانەکە. وێ دەچوو هەموو چاوەکان لە روانینی بۆ ئەوان وەرگەڕانەوە.

مانسیۆر دیفارج وتی: ((سەروەران، رۆژتان باش)).

دەست بەجێ هەموو زبانەکان کرانەوە دەنگێکی بە کڵپەی گریانەوە وتیان: ((رۆژباش)).

دیفارج دەستی راوەشاند و وتی: ((هەوایەکی ناخۆشە، سەروەران)).

بە دوای ئەو قسەدا هەموویان سەیری پاڵ دەستەکانی خۆیان کرد و سەریان داخست و بێدەنگ بوون. پیاوێك هەستایە سەر پێ و چووە دەرەوە. دیفارج بە ئیشارەتەوە وتی بە خاتوو دیفارج : ((ژنەکە! سەفەرێکی دوور و درێژم لەگەڵ ئەم برادەرە(دروستکەری رێگەوبان) کردووە. هاوڕێیەکی چاکە پێی دەڵێن جاکیۆس. شتێکی بدەرێ با بیخواتەوە.

دووەمین پیاو هەستا چووە دەرەوە خاتوو دیفارج شەڕابی هێنا بۆ دروستکەری

ڕێگە و بان کە پێی دەوترا جاکیۆس. کڵاوەکەی بە نیشانەی ڕێز و سڵاو داگرت. سێیەمین پیاو هەستا چووە دەرەوە.

مانسیۆر دیفارج بە خواردنەوەی تۆزێ شەڕاب خۆی نوێکردەوە.

سەیری کەسی نەکرد. کەسیش سەیری ئەوی نەکرد. تەنانەت خاتوو دیفارجیش دوورینەکەی ڕانەگرتەوە و دەستی کردەوە بە ڕستن.

لە درێژەدا وتی: ((ئەرێ هاورێم تەواوتکرد؟)).

((بەڵێ سوپاس)).

((کە واتە بێ بەدوامدا هۆدەکەی خۆت ببینە کە ئامادەیە.بڕۆ خۆت بحەسێنەرەوە)).

چوونەدەرەوە بۆ ناو حەوشەکە و پاشانیش بە پلەکاندا سەرکەوتن بۆ هۆدە تروسکەکە هەر ئەو هۆدەیەی کە جارێکیان پیاوێکی سەرسپی سەری دانەواندبوو خەریکەی پێڵاو چاککردن بوو.

ئێستا پیاوێکی سەرسپی لێنەبوو. بەڵام سێ پیاوی تری لەوێبوون. ئەو سێ پیاوەی کە لە درزی دەرگاکەوە سەیری پیاوە پیرەکەیان دەکرد. هەر ئەو سێ پیاوە بوون کە یەك یەك لە دوکانەکەوە هاتنە دەرەوە. سێ جاکیۆس.

دیفارج لەسەرخۆ دەرگاکەی داخست بە دەنگێکی سووکەوە وتی: ((جاکیۆس یەك، جاکیۆس دوو، جاکیۆس سێ شایەدن من (جاکیۆس چوار) فەرمانم پێدراوە بۆ ئەم چاوپێکەوتنە. ئەویش هەموو شتێکیان پێدەڵێت، جاکیۆس پێنج)).

دروستکەری ڕێگە و بان بە کلێتەکەی دەم و چاوی پاککردەوە.

((مانسیۆر من ئەبێ لە کوێوە دەستپێبکەم؟)).

((لە سەرەتادا ئەبێ ڕاست بێت)).

((یەکەم جار نزیك یەك ساڵ لەمەوپێش گاسپێردم دیت. لە ژێر گاریەکەی مارکۆسدا. کە بە زنجیر هەڵواسرابوو. گارییەکە خەریك بوو بەسەر گردەکە سەر دەکەوت)).

جاکیۆس سێهەم پرسیاری کرد ئەی چۆن پاش ماوەیەك ئەوی ناسییەوە.

((بە باڵابەرزیدا. کاتێك مارکۆس ئەوەی کەحەزی لێدەکرد داوای لێکردم منیش وتم بە قەد دێویّ ئەبێت!)).

جاکیۆسی دووەم وتی: ((تۆ ئەوەت وت کە بچکۆلە بێتەوە)).

((بەڵام لەم کاتەدا ئەو هیچی نەکرد. باش پاشەکشێی کرد. لەراستیدا ئەوەی کرد کە کردی. خێرا ون بوو. گەورە و بچووك بۆی دەگەڕان. چەند مانگ لە دوای گەڕان؟ دە یان دوانزدە؟)).

دیفارج وتی: ((چەند مانگ گوم بوو گرنگ نییە. خۆ سەرەنجام گیرایەوە. درێژەی بدەریّ)).

((جارێکی تریش لە سەر گردەکە خەریکی ئیشکردن بووم. شەش سەربازم دیت ئەهاتن. لەناویاندا پیاوێکی باڵا بەرزم دیت کە هەر دوو باڵیان بەستبوو بە لەشیەوە. هەمویان خۆڵاوی بوون کاتێك کە تێپەڕیان کرد پیاوە باڵابەرزکەم ناسییەوە. بەڵام لەم کاتەدا ئەو نەیتوانی لە گردەکەوە بەرەو خوار را بکات. سەرگەورەی سەربازەکان پێی وت. ((وەرە)). خێرا بهێنن بۆ گۆڕەکەی. ئیتر ئەوان هەر بە پاڵ هێنایان بۆ بەر ئاوایی کە کەوت بەزەویدا هەڵیان ساندەوە. کە هەڵیان ساندەوە چاوی خۆڵ و خوێناوی پێوە بوو دەستیانکرد بەپێکەنین. کە نەی ئەتوانی پاکی کاتەوە هێنایان بۆ ناو ئاوایی، خەڵك هەمووی لێیان کۆ بووەوە. بە ناو شەقامەکاندا تێپەڕیان کرد. بە پەشۆکاوی رۆیشتن و سەرکەوتن بۆ زیندانەکە. دەرگاکانی زیندان کرانەوە. ئاوا(دەمی کردەوە و خێرا بەستی وەك بڵێی شتێکی قوتدا) قوتیدا)).

دیفارج وتی: ((دەی درێژەی بدەریّ جاکیۆسی پینجەم)).

((هەموو خەڵکی ئاوایی لای کانییەکەدا دەستیان کرد بە چپە کردن. دوایی رۆشتن بۆ خەوتن بەڵام بە داڵغەی ئەو پیاوە گیراوە خەونی خراپیان دیت. لە بەر ئەوەی کە ئیتر جاریکیتر لەویّ نایەتە خوارەوە هەتا ئەمرێت. سەر لەبەیانی لە ناو هۆڵە بچکۆلەکەیدا بالای بەرزی دەرکەوت. کە لە پشت تولە ئاسنینی پەنجەرەی زیندانەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد. وردی دەرەوە دەبووەوە کە جارێکیتر قەت بۆی نەیە تێیدا بگەڕێ و پیاسە بکات)).

ئەو چوار گوێگرەی تر بە ماتەمەوە سەیری یەکتریان دەکرد. بە ناوچەوانی هەر کامیانەوە ئاواتی ڕۆژیی تۆڵە ئەستاندنەوە دیار بوو. هیوایان دەخواست ببنە قازی لە کاتی گوێگرتن بۆ کابرای دروستکەری ڕێگەوباندا.

دروستکەری ڕێگە و بان وتی: ((ماوەی هەفت ڕۆژان لەوێ مایەوە. هەموو خەڵکی ئاوایی ئاگایان لێبوو. بەڵام بە دزیوە چونکە دەترسان. لەکاتی ئێوارەدا. ئەو دەمەی کە خەڵکی ئاوایی لە سەر کانییەکەدا یەکیان دەگرتەوە. بەتێکڕا سەرنجیان بۆ لای زیندانەوە ڕاکێشا. هەندێکیان وتیان ئەو بۆ مردن ڕانەگیراوە. چون داخوازییەك نێرراوە بۆپاشا کەتێیدا نیشاندراوە کە بە بۆنەی مردنی منداڵەکەیەوە شێت بووە)).

جاکیۆسی یەکەم وتی: ((گوێ ڕاگرن! داخوازییەك نێردرا بۆ پاشا. لێرە گشت کەس بڕوات پێدەکات کە پاشا لە نێو گارییەکەدا داخوازییەکەی وەرگرت لە سەر شەقامدا. کە لە پاڵ شاژندا دانیشتبوو. ئەویش دیفارج بوو لێرەدایە. کە لە تاقیکردنەوەیکدا لە ژیانی خۆیدا، ڕایکرد بۆ سەر ڕێگە و بەری ئەسپەکانی گرت و دادخوازییەکەی دایە دەستی پاشا)).

جاکیۆسی سێ وتی: ((هەروەها منیش ئەزانم. کە پارێزەرانی پاشا دەوری ئەویانگرت و تێهەڵچوون)).

دیفارج وتی: ((درێژەی بدەرێ)).

((سەر لە بەیانی ڕۆژی دوو شەممە، لەو کاتەی کە خەڵکی ئاوایی لە خەو هەڵدەستن. لە سەر کانییەکەدا دارێکیان(داری قەنارە) هەڵخست کەچواردە پێ بەرز بوو)).

بۆ ئەوەی نیشانبدات کە بەرزایی دارەکە چەندە، دەستی بۆ هەڵخست.

((هەموو کار و فرمانێکی ئاوایی ڕاوەستا کەس حەیوانەکانی نەکردە دەرەوە بۆ لەوەڕاندن خەڵك هەمووی لەلای کانییەکەدا کۆ بوونەوە. لەکاتی نیوەی ڕۆژدا دەنگی دەهۆڵ دەهات ئەویان لە زیندانەکەوە هێنایە خوارەوە کە بە چواردەوریدا سەرباز گرتبوویان. ئەو هەر وەك پێشوو بەسترابووەوە. تەنانەت دەمیشی بە پەمۆیەك بەسترا بوو لەبەر ئەوەی قسە نەکات. هەروەها، بێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت هەر لەوێ

هەڵیان واسی . پاش مردن  بە هەڵواسراوی لەوێدا بەو بەرزییەوە جێیان هێشت زۆر ترسێنەر بوو، باشە ئیتر ژنان چۆن ئەتوانن لەو کانییە ئاو بهێنن؟ لەکاتێکدا سێبەری ئەو تەرمە هەڵواسراوە بە سەر کانییەکەوە بێت، ئیتر منداڵان چۆن بێن بۆ لای کانی بۆ یاریکردن؟)).

((زۆر ترسێنەر بوو. سەر لە ئێوارەی دوشەممە بوو من ئاواییم جێهێشت. ئەویشم بەجێهێشت. کە لام کردەوە سێبەری داری هەڵواسینەکەم بە سەر کلێساوە دەبینی. بە سەر ئاشەکەوە دەمبینی، هەروەها بە سەر زیندانەوە. من کە ئاگادار کرام ئەم پیاوەم دیت. لەگەڵ ئەودا تا ئێرە بەپێ هاتووم. لەگەڵ ئەودا سوار دەبووم و دابەزیوم. دوێنێ شەو تەواو دوێکە کە لەگەڵ ئەودا بووم. ئێستاش ئێوە من دەبینن)).

پاش ماوەیەك بێدەنگی جاکیۆسی یەکەم وتی: ((باشە تۆ بە ئیمانەوە کارت کرد و گێڕاتەوە بۆ ئێمە. ئەتوانی تۆزێ بچیتە دەرەوە چاوەڕوانی ئێمە ببیت؟)). دروستکەری رێگە و بان وتی: ((بەسەر چاو)). دیفارج لەگەڵیدا هاوڕێی کرد تا دەرەوە تا سەر پلەکان پاشان گەڕایەوە.

جاکیۆسی سێ وتی: ((تۆ دەڵێی چی. ئەتوانم ناوی بخەمە ناو لیستەکەوە؟)).

دیفارج وتی: ((ئەرێ. بیخەرە ناو لە بەین چووەکانەوە)).

جاکیۆسی یەکەم: ((قەڵاکەو هەموو بنەماڵەکەی ئێڤرمۆند؟)).

دیفارج دووپاتی کردەوە: ((قەڵاکە و هەموو بنەماڵەکان)).

ژمارەیەك وتی: ((دڵنیایت کە لیستەکەی هێشتا هەر ماوە؟)).

((ئەمە راستە کە بە شێوەیەکی نهێنی نووسراوە کە خۆمان نەبێت کەس لێی تێناگات باشە ئەی ئەگەر ئێمە گیراین ژنەکەت ئەتوانێ لە کاتی پێویستدا بیخوێنێتەوە؟)). دیفارج بە بڕوای تەواوی وتی: ((جاکیۆس قەت لەوە مەترسە لیستەکە بۆ ئەو ژنی منە زۆر پێویست نییە. کاتێك کە ناوێك دەنووسرێت هەر ئەو ناوە لە مێشکی ژنەکەی منیشدا دەنووسرێت. ئەو ناوەکان دەڵێ بە خۆی هەروەها کە خەریکی رستنە)).

بە راستی هەر ناوێك لە مێشکیدا دەڕواتە بەر تەقەڵ و دوورینەوە تەنانەت بە

لیستەیش لە کاتی دوورینەوەدا کە لەبیری ناچێت.

گشتیان لە بەر خۆیانەوە وشەی پەسەندکردنیان دەگوتەوە. تا یەکێك وتی: ((ئەی دەربارەی دروستکەری ڕێگە و بان؟ ناگەڕێنرێتەوە بەم زووانە؟ خۆ زۆر ئاسانە ئەی باشە هیچ خەتەری لێ هەستناکرێت؟)).

دیفارج وتی: ((ئەو هیچ شتێ نازانێت. خۆم ئاگام لێی ئەبێت. ئارەزووی وایە کە دنیایەکی جوان پەیدابکات. پاشا، شاژن، هەروەها دادگا. ئەو ڕۆژی یەکشەممە چاوی پێیان بکەوێت پاشان دەیگێڕمە دواوە).

((چی؟! ئەمە عەقڵە ڕێگەی پێبدرێت پاشا و نەجیبزادەکان ببینێت؟)).

دیفارج وتی: ((جاکیۆس ئەگەر شێر نیشانی پشیلە بدەیت. حەز دەکات بیخواتەوە. ئەگەر کەروێشك نیشانی سەگ بدەیت لە چەند ڕۆژێکدا دەیکوژێت)).

زیاتر وت و وێژ نەکرا، ئیتر هەر یەکەو چوون بە لایەکدا.

چەند ڕۆژێك دروستکەری ڕێگە و بان لە دوکانی شەرابفرۆشییەکەدا مایەوە. ژیانی نوێ و بە دڵی خۆی بوو. بەڵام مادام دیفارج زیرەی پێکردبوو، دایمە بێدەنگ بوو دایمە خەریکی دوورین بوو هیچ تێبینییەکی لەمانەوەی ئەودا نەدەنا، کاتێك ئەوی دەبینی پێیەکی بۆ ئەچەسپاند ( واتە وەك مەشقی سەربازی).

ئەو هەر ڕۆژانی یەکشەممە حەزی لەوە نەدەکرد کە هاوڕێی دیفارج بکات بۆ چاوپێکەوتنی پاشا.

وەك هەمیشە خاتوو مانێت خەریکی دروومان بوو. تەنانەت لەکاتی سوار بوون لە گاری و لەشوێنە گشتییەکانیشدا.

یەکێك لەرێبوارەکان وتی: ((خاتوون، دایمە خەریکی دوورینینت)).

((ئەوە چی ئەچنیت؟)).

((زۆر شت)).

((وەك چی؟)).

خاتوو مانێت وتی: ((بۆ وێنەکفن بۆ گۆڕ)).

پیاوەکەش خێرا تا بۆی کرا لێی دوور کەوتەوە. دروستکەری ڕێگە و بانیش بەو

وشه هەژا، بەڵام کاتێك کە چاوی بە پاشا کەوت و قژە زەردەکانی شاژنی لە نێو گارییەکەدا دیت هەموو شتێکی لەبیر چوو، سەرنجی راکێشا بۆ لای ئەو هەموو ئافرەتە جوانانەی کە سەر بەدادگا بوون. وەك روانین بۆ ئەو هەموو ئافرەتە دەم بەپێکەنینانە، و یان ئەو دەوڵەمەندە باشانەیان روانین بۆئەو هەموو ئاڵتوون، یان ئەو ئاریشمە رۆشنانە یان ئەو وێنە بەتەکەبورانە.

دروستکەری رێگە و بان شتێکی لە یاد چوو بوو. کلێتە شینەکەی هەڵگرت و هەڵی خولاند و هەتا توانی هاواری کرد: ((بژی پاشا، بژی شاژن)).

دیفارجیش کاتێك کە هەچی قسەیەتی تەواو بوو وتی: ((ئەها! تۆ هاورێیەکی باشی)). دروستکەری رێگە و بان خێرا شپرزە بوو بە خۆیدا چووەوە نەکا غەڵەتێکی کردبێت: بەڵام، نە!

دیفارج چپاندی بە گوێدا وتی: ((بە راستی تۆ هەر ئەو هاورێیەت کە ئێمە ئەمانەوێت. کە وایلێهات کاری ئێمەت رەحەتتر کردووە)).

دروستکەری رێگە و بان پەسەندیکرد.

دیفارج هەر درێژەی دایە:))ئەم بێ عەقڵانە هیچ نازانن. تۆ بەسووکی سەیر دەکەن تەنانەت ئەسپ و سەگەکانیان. وەرە با ئێمەش زۆرتر گاڵتەیان پێبکەین. رۆژی ئێمەش هەر دێت)).

خاتوو دیفارج بەنیگایەکی ساردەوە سەیری دروستکەری رێگە و بانی کرد و وتی: ((تۆ گوێ بگرە. ئەگەر پۆلێك پەلەوەرت نیشانبدەن کە توانای هەڵفڕینیان نەبێت. پێت بڵێن ئادەی پەڕەکانیان لێکەرەوە بۆخۆت تۆش خێرا دەستپێدەکەیت تا دوا دانە پەڕی لێدەکەیتەوە. نایکەیت؟)).

((با، چۆن نایکەم خاتوون)).

خاتوو مانێتیش دەستی راکێشا بۆ نیشاندانی رێگەکە و وتی:))خۆ تۆ ئەمرۆکە ئەو پۆلە پەلەوەرتە دێت، ئێستا بڕۆرەوە)).

## - ١١ -

# جاسووس

کاتێك کە دیفارجەکان (ژن و مێردەکە) بە ناو قورِ و چلّپاودا رێگەیان گرتە بەر و بەرەو ماڵ کەوتنە رێ خاتوون بەمێردەکەی گوت: ((ئەوە جاکیۆسی پولیس چی دەگوت؟)).

((کورە ئەم شەو شتێکی وا نەبوو، بەڵام دەیگوت جاسووسێکی تازە هاتۆتە نێو ئەم بەشەی شارەکەمانەوە)).

((ئەها، باشە! پێویستە ناوی بخەینە نێو لیستەکەوە. ناوی چییە؟)).

((ناوی جان بارسادە، خەڵکی ئینگلتەرایە)).

((باشە. هیچ شتێك گوتراوە دەربارەی رواڵەتیەوە؟ قیافەی چۆنە؟)).

((تەمەنی لە دەوری چل ساڵ دایە. باڵای پێنج پێ و نۆ ئینچ بەرزە، قژی رەشە دەم و چاوی باریکە لووتی بەلای چەپا لارە)).

مادام وتی: ((زۆر روونە ئەبێ بخرێتە نێو لیستەکەوە)).

لە نیوەی شەودا کە گەیشتنەوە دوکانەکە. مادام دیفارج دەستیکرد بەژماردنی ئەو برِە پارەیەی کە لە ماوەی نەبوونی ئەواندا لە دوکان کۆ ببووەوە. لە هەمان کاتدا مێردەکەی هەر مژی ئەدا لەسەبیلەکەی و خوار و ژووری دەکرد. ژنەکە هەر خەریکی حساب و کتاب بوو کە سەرنجیدا مێردەکەی تۆزێ هیلاکە و خەفەتیش دایگرتووە.

وتی: ((باوەرِەکەی کز و دڵ نیگەرانیت؟)).

وەڵامی دایەوە وتی: ((تۆزێ. ماوەیەکی زۆریشە)).

بە هێمنی وتی: ((بەڵێ. ماوەیەکی زۆرە. بەڵام تۆڵە ئەستاندن زۆر دەخایەنێت. ئێمە ئەبێ چاوەروان بین و لە خۆبردوویيمان هەبێت. یادی ئەو رۆژە بکەینەوە کە داهاتووی لێ نزیکتر دەکاتەوە. سەیری دەور و بەر بکە چۆن دنیا پرِی بووە لەنارِەزایەتی و پیسی لە تۆ وایە ئەمانە ئەتوانن ون بن؟)).

((تۆ راستدەکەیت. بەڵام تا ئێمە زیندووین ئەو رۆژەی کە نەمانی ئەوان بێت نایەت)).

((ئەگەر ئەمەش روو بدات، ئێمەش ئەبێ هەوڵبدەین بۆ هاتنی. هیچکام لەم شتانەی ئێمە دەیکەین لە خۆڕایی نییە. من بۆ خۆم بڕوام بەوە هەیە کە ئێمەزیندووین و سەرکەوتنیش بە چاوی خۆمان دبینن)).

رۆژی دواتر خاتوون لە شوێنە تایبەتییەکەی خویدا خەریکی دروومان بوو کە غەریبییەك هاتە ژوورەوە. کە دی ئەو هاتە ژورەوە بۆ ناو دوکان گوڵێکی سووری دا لە سەری خۆی و تۆزێ لە دوورینەکەی خۆی کەمکردەوە. وردە وردە خەڵکان چوونە دەرەوە. دوکانەکەیان جێهێشت.

غەریبە وتی: ((رۆژ باش، خاتوون)).

بە دەنگێکی بەرز وتی: ((رۆژ باش. مانسیۆر)). لە بەر خۆیەوە وتی: ((تەمەن لە دەوری چل ساڵ، باڵا پێنج پێ و نۆ ئینچ. قژ رەش . روومەت درێژ و باریك لووت بەلای راستدا لارە. رۆژ باش)).

غەریبە پاش ئەوەی داوای خواردنەوەی کرد، وتی: ((خاتوون، بە شێوەیەکی وەستایانە دەیدووریت)).

((خوم پێ گرتووە)).

((ئەوە بۆچی ئەبێت؟)).

((بۆ بتاقەتی)).

((بازاڕتان باشە؟)).

((بازاڕمان باش نییە. خەڵك فەقیرن)).

((ئای خەڵکی هەژار و بەدبەخت. خراپ لێیان قەوماوە وەك تۆ دەڵێی)).

خاتوون راستی کردەوە: ((وەك تۆدەڵێی)).

((ببوورە، ئەوە من بووم دەمگوت. هەڵبەتە تۆش ئەمە بیر و بۆچوونتە)).

خاتوون بە دەنگی بەرزەوە وتی: ((بۆچوونی من؟ خۆم و مێردەکەم هەر ئەمەمان پێکراوە کە ئەم دوکانە رابگرین. بێئەوەی بیر لە شتی تر بکەینەوە. تەنها شتێك کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە ئەمەیە کە چۆن بژین)).

جاسووسەکە کە بۆ کۆکردنەوە و دۆزینەوە و دروستکردنی هەر هەواڵ و زانیارییەك هاتبوو، بواری بە خۆی نەدەدا کە نائومێدی بە ناوچەوانیدا دەر بکەوێت. بۆیە هەر درێژەی دەدایە.

((ئاوا، بازاڕ باش نییە، ئاخۆ بۆ گاسپێردی هەژار...!)).

مادامیش بە هێمنی وتی: ((ئەگەر خەڵك لە چەقۆ کەڵك وەربگرن بۆ ئەو مەبەستە ئەبێ پارە بدەن)).

جاسووس دەنگی نزم کردەوە و وتی: ((باوەڕ دەکەم کە ئەمە زۆر جێی داخە بۆ هاوڕێیەکی هەژار لەم دراوسێیانەدا. تەنانەت لە مردنیشدا زۆر ئازار بچێژێت)).

((ها لێرا؟ ئەها! مێردەکەم لێرەدایە!)).

جاسووس کڵاوەکەی گرت بە دەستیەوە و وتی: ((رۆژ باش، جاکیۆس!)).

دیفارج کوتوپڕ وەستا و بە رقەوە سەیریکرد.

جاسووسەکە دوپاتی کردەوە: ((رۆژ باش، جاکیۆس!)).

دوکاندارەکە وتی: ((تۆ گومانت کردووە. ناوی من ئەوە نییە. ناوی من ئێرنیست دیفارجە)).

دیسان جاسووسەکە نائومێد بووەوە وتی:))تەواوە هەر ئەوەیە. رۆژباش!)).

دیفارج بە هێمنی وەڵامی دایەوە: ((رۆژ باش!)).

((ئەمەش تێبینییەکە بۆ مادام کە لەشەقامی ئانتۆینەدا بە نیسبەت گاسپێردی هەژارەوە هەندێ رق و بێزاری هەن)).

((کەس شتی وای بە من نەگوتووە. من هیچ شتێك دەربارەی نازانم)).

((جاسووسەکە ئارەقەکەی نا بە سەرو و وتی هینیترم بۆ بێنە)).

((ناوی تۆ، مانسیۆر دیفارج، منی خستە یادی ئەربابی کۆنت، دکتۆر مانێت ئەوە کەی ئازاد بوو. وا بزانم هاتۆتە لای تۆ)).

((بەڵێ ئەوە راستە)).

((من دکتۆر مانێت و کچەکەیم لە ئینگلتەرا ناسیوە. تۆ شتی زۆرتر دەربارەی ئەوان دەزانی؟)).

((نه)).

((ئەو ئەیەوێ شووبکات نە بە پیاوێکی ئینگلتەرایی. بیری گاسپێرد بکەرەوە، گاسپێردی هەژار. ئەمە شتێکی نامۆیە کە ئەو ئەیەوێ مێرد بە برازاکەی مارکۆس بکات ئەوەی کە گاسپێرد کوشتی. مێردی داهاتووی دەبێت. هەڵبەتە مارکۆس ئێستا لە ئینگلتەرادا بە نامۆیی و نەناسراوی دەژی. ئەو لەوێ بە مارکۆس نەناسراوە. لەوێ ناوی چارلز دارنییە. ناوی بنەماڵەیەکی دایکی دکتۆر لەرێگەی ئینگلتەراییەکەوە ئەم ناوەی بۆخۆی دروستکردووە)).

ئەم هەواڵانە هیچ ئەسەرێکی لە سەر خاتوو دیفارج دانەنا. بەڵام لە سەر مێردەکەی کاریگەرییەکی زۆری دانا. لە کاتێکدا کەدەیویست بەتەواوی خۆی هێمن و خۆڕاگر نیشانبدات هێزی ئەوەی نەمابوو کە بەرگری لە لەرینەوەی دەستی بکات کە سەبیلەکەی پێ ڕاگرتبوو. ئەگەر ئەو جاسووسەکە لەسەرنجەکانیدا تێبشکایە ئەوا جاسووسی نەدەکرد.

ئەمە مل پیا کردنە. لەکۆتاییدا سەرکەوتنێکی بەدەستهێنا، بارساد هەستا خواردنەوەکەی حسابکرد و ڕۆیشتنە دەرەوە پاش چەند دەقەیەك قسە کردن ژن و مێرد بەردەوام لەوێ مانەوە تا ئەویش چووە دەرەوە. خەمی ئەوەشیان بوو کە لەوانەیە بگەڕێتەوە.

دیفارج بەسووکی وتی: ((تۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێت؟)).

مادام وەڵامی دایەوە: ((ئەوەی کە ئەو دەیوت لەوانەیە درۆ بێت بۆی هەیە ڕاستیش بێت)).

((ئەگەر وابێت و ئەگەر تا ئێمە ئەژین ئەمە کۆتایی پێبێت، یا خوا چارەنووسی مێردەکەی لە دەرەوەی فەڕەنسا بپارێزێت)).

((چارەنووسی بۆ ئەو شوێنەی کە خۆی ئەیەوێ بڕوات ئەیپارێزێت و بەرەو کۆتایی پێهاتن ئاراستەیان دەکات. ئەو کۆتاییەی کە خۆیان دەیان هەوێت. ئەمە تەواو بۆچوونی منە)).

سەر لە ئێوارە مادام دیفارج دەیویست لەشەقامی ئانتۆینەدا لە شوێنێکەوە بۆ

شوێنێکیتر بچێت. بۆ سەردانی ژنێك كە ئـەویش وەك خـۆی خـەریكی دووریـن بـوو. ئەوان هەر بێ خود شتیان دووریبوو. بۆیە ئەو كارە میكانیكییە (واتە ئەو كارەی كـە زۆرتر مێشكی پێ هیلاك نابێت) ئەوانی لە خواردنەوە و خوادرنی دابڕیبوو. دەسـتیان لەبریتی دەمیان كاری دەكرد. هەر كەدەستیان لەكاركردن هەڵگرت خێـرا مەعیـدەیان داوای خواردن دەكات.

كاتێك كە هەوا تاریك بوو. تاریكایی تەواوی فەڕەنسای داگیركرد.

زەنگی كلێساكان كە لـەهـەوای خۆشـی ئێۆارانـدا دەنگـی دەهـات. ئێـستا دەبـێ لەگەڵ دەنگی تفەنگدا تێكەڵبێت. ئەو بانگـەی كـە دوێنـێ بـەهێز بـوو ئێـستا دەبـێ بێدەنگ بێت و بمرێت. ئەو ئافرەتەی كە لە شـەقامی ئانتۆینـەدا تـا دوێنـێ خـەریكی دروومان بوو بەم زووانە ئەبێ شتێ بدوورێت كە تا ئێستا نـەدووراوە و ئـەبێ ئـەو كـە لەسەرانە بژمێرێ كە دەیان بڕن. ئەوان ئەبێ لە پاڵ گالیۆتن (داری سەربڕین)دا[1] هەر بدوورن.

١- داری سەربڕین :(GUILLOTINE)كەرەسەیەكە كە بریتییە لە ئاسنێكی تیژ كراو كە لە بەینی دوو كۆڵەكەی ئاسنیدا دروستكراوە. لەلای خوارەوەی ئەوەوە ئاسن یا دارێكی وەك كۆتە دانراوە كەسەری تاوانباریان تێدەكرد و ئاسنە تیژەكەش بە هێزەوە دەهاتە خوارەوە كە لەپشتی ملەوە زەلامەكەی سەر دەبڕی. ئەم كەرەسەی سەربڕینە یەكەم جار لە ئیتالیا لە ساڵەكانی ١٣٠٠ دا بۆ ئەو مەبەستە بەكار هێنرا. كەئەم كەرەسەیە دكتۆر گۆیلۆتین (Dr. guillotine) بۆ ئەم مەبەستە لە كاتی شۆڕشی فەرەنسەدا هێنای. ئەم كەرەسەیە دەستكردی دكتور گۆیلۆتین نەبوو، لویس ئانتۆینە دروستیكرد یەكەمجار پێیان دەگوت لویس.

# - ١٢ -

# شادی و پەژارە

ئەو رۆژە رۆژی زەماوەندی لویس مانێت و چارلز دارنی بوو. هەتاوی نیوەڕۆ رۆشن و بەتین بوو. مستر لۆری، لویس و خاتوو پرووس لە دیوی دەرەوەی هۆدەکەی دکتۆر بوون. لە ناویشەوە دکتۆر و چارلیز سەرگەرمی قسەکردن بوون. خێرا گشتیان رۆیشتن بۆ کلێسا.

بووك زۆر جوان بوو. نە مستر لۆری و نە خاتوو پرووس نەیان ئەتوانی زۆر باسی جوانی ئەو بکەن.

مستر لۆری وتی: ((ئای ئازیزەکەم! ئەمانە هەمووی بۆ ئەم رۆژە بوو. یادی بەخێر ئەو کاتەی کەتۆم بەمندالّی لە باوەش دەگرت و بە سەلامەتی بە ناو ئینگلتەرادا تێپەرمان کرد. بەڕێز چارلز ئەبێ بەنسبەت من رێزی زۆرتر بێت. خۆ قەت وا بیرناکەیتەوە خاتوو پرووس، ها؟)).

خاتوو پرووس وتی: ((قسەی قۆڕ خۆ تۆ ئەو کارانەت لەبەر خاتری دارنی نەکردووە، ئیتر لەبەرچی ئەو ئەبێ مەمنوونی تۆ بێ؟)).

مستر لۆری وتی: ((لەوانەیە تۆ راستکەیت، بەلّام ئەی بۆ ئەگریت؟)).

لە راستیدا خاتوو پرووس ئەوەندە خۆشحالّ بوو کە بە چاوانیدا فرمێسك دەهات. بەلّام سۆزێکی شاراوەی پێبوو. سۆزەکەش ئەوە بوو کە براکەی ماوەی چەند سالّ پێشتر جێ هێشتبوو و تا ئێستاش هەر خۆشی دەویست نەبوو بەمێردی لویس.

خاتوو پرووس وتی: ((من ناگرێم. بەلّام بە چاوانتەوە فرمێسك دەبینم)).

مستر لۆری وتی: ((ئەو فشە. بە چاوانی منەوە؟ ئادەی خۆشەویستم لویس گیان پێش ئەوەی چارلز بێتە دەرەوە بتبات بۆخۆی ماچێکم بدەرێ با هەستی خۆمت پێ بنوێنم)).

دەرگای هۆدەکەی دکتۆر کرایەوە و لەگەڵ چارلز دارنیدا هاتە دەرەوە. رەنگی روومەتی پەڕیبوو وەك مردوو زەرد بوو بوو تەنانەت درزێکی رووناکی تێدا نەدەبینرا. بەڵام هەڵس و کەوتی هێمن بوو خۆیشی خۆشحاڵ نیشاندەدا. نیگای چاوی مستر لۆری نیگایەکی فێڵاوی نەبوو. ئەو دەیزانی کە شتێك لە ژوورەوە روویداوە. بۆیە ئاوا حەپەساوە.

دکتۆر باڵی خستە سەر شانی لویس و هێنایە خوارەوە بۆلای گارییەکەی کە مستر لۆری پێشتر بۆ کاری پێویست بەکرێی گرتبوو. ئەوانی تریش بە گارییەکی تر کەوتنە دوایان و خێرا لەکلێسایەکی دراوسێیاندا، بێ ئەوەی هیچ لاوەکییەك لەوێدا حازر بێت، لویس مانێت و چارلز دارنی بوون بەژن و مێرد.

بۆ خواردنی ناشتا گەڕانەوە بۆماڵەوە، هەموویان خۆشحاڵ بوون. هەندێ ئەڵماس کە لەلایەن مستر لۆرییەوە پێشکەشکرابوو بە سەر شانی لویسەوە بریقەی دەدایەوە. خێرا لویس خواحافیزی لە باوکی کرد. بۆ ئەوان ئەمە جیا بوونەوەیەکی قورس بوو بە تایبەت لەو کاتەی کە ئەو لە فەرەنسەوە هاتووە بۆ ئینگلتەرا. بەڵام ئەمەش ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت لەوانەیە پاش دە پانزدە رۆژی تر یەکتر ببیننەوە. پاشان پێکەوە ماوەی پشودانیان تەواو دەکەن و دەگەڕێنەوە.

لەکۆتاییدا باوەشی لەملی کچەکە کردەوە: ((بیبە چارلز هین خۆتە)). لە شووشەی گارییەکەوە دەستی دیار بوو کە بۆ خواحافیزی تەکانی دەدا کە ئەڕۆیشت دکتۆر و مسترلۆری و خاتوو پرووس دەستیان بۆ ماڵ ئاوایی تەکان دەدا.

تا کاتێك کە لەبەر چاویان ون بوون.

دکتۆر زۆر شادمان بوو و بە سەر کەوتوویییەوە هەوڵیدا بۆ ئەوەی کامەرانی کچەکەی بە فیڕۆ نەدات.بەڵام هەندێ شت بوون کە ئازاری ئەویان دەدا لەکاتێکدا کە دەستەکانی کێشا بەناوچەوانیدا و بە شپرزی و هیلاکی روویکردە هۆدەکەی خۆی. مستر لۆری یادی کاتی پینەچییەتییەکەی کردەوە کە لەماڵ مانسیۆر دیفارج دابوو. وتی بە خاتوو پروس: ((وا بزانم باشتر وایە ئێمە هیچمان لەگەڵی نەدوێین و موزاحیمی نەبین من ئەبێ بڕۆم بۆلای تیلسۆنەکان و خێرایش بگەڕێمەوە. پاشان هەڵدەگەرێین و

دەچین بۆ لادێ بۆ خواردنی نانی ئێوارە وا خۆشحاڵتر دەبین)).

تا گەڕایەوە دوو سەعاتێکی پێچوو. کاتێك هەنگاوی بەرەو سەر دەنا بەرەو هۆدەکەی دکتۆر بە دەنگی تەقەی دەرگایەکی بەرز راچڵەکا.

بە هەڵپەوە وتی: ((خوایە هاوار، چی بووە؟)).

خاتوو پرووس بە هێمایەکی ترساو و رەنگ پەڕیوەوە دەرکەوت هاواریکرد.

وتی: ((هەچی شتە تەواو! تازە تەواو بوو! ئیتر چی بڵێین بەلویس گیان؟ تەنانەت من و پێڵاوە دروستکراوەکانیشی ناناسێتەوە)).

مستر لۆری ئەوەی کە پێیکرا بۆ هێوەر کردنەوەی خاتوو پرووس وتی و خۆی کرد بە هۆدەکەی دکتۆردا. مێزەکەی هەڵگێرابووە رووبە پەنجەرەکە و سەری کردبووە کارەکەی خۆی.

((دکتۆر مانێت! هاوڕێی خۆشەویست! دکتۆر مانێت!)).

بۆ چرکەیەك نیوە قسە و نیوە توڕە بەسەر قاڵییەوە سەری بەرز کرد و دیسان بەردەوام مایەوە لە سەر ئیشەکەی خۆی. مستر لۆری تێگەیشت کە ئەو خەریکی چاك کردنەوەی پێڵاوە. ئەو تاکەکەی هەڵگرت کە لەپاڵ خۆی دانابوو وتی: ((چی بووە؟)).

((پێڵاوی پیاسە کردنی ئافرەتێکی هەرزەکارە. ئەبوایە ئێستا زۆر دەمێکە تەواوم کردبایە)).

((بەڵام دکتۆر مانێت سەیری من بکە)).

بە نیشانەی ملکەچ بوون سەری راوەشاند وەك ئەوەی کە عادەتی گرتبێ بە جێبەجێ کردنی ئەمرێك.

((منت لەبیر نییە. هاوڕێی خۆشەویست؟ دیسان بیرکەرەوە. ئەمە ئیشی تایبەتی تۆنییە. دەی بیرکەرەوە هاوڕێی خۆم. دەی)).

بەڵام ئەمانە بێکەڵك بوون. ئەو هەر بەردەوام مایەوە لە سەر کارەکەی خۆی تەنانەت بۆ وتنی یەك وشەیش بەرگری لە خۆی کرد.

مستر لۆری بڕیاریدا کەئەمە ئەبێ وەك نهێنییەك بپارێزرێت لە لویس و هەموو

ئەوانەی کە دەیناسن. بە یارمەتی خاتوو پرووس، بەدۆستەکانی دکتۆر وترا کە ناساغە و پێویستی بە چەند ڕۆژێك پشوودان هەیە. دەربارەی لویسیش، خاتوو پرووس بە هیوا بوو بۆی بنووسێ کە داوای لێکراوە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بڕوات ئاگاداری نەخۆشێك بکات.

بە هیوای چاکبوونەوەی ئەوەوە. مستر لۆری بڕیاریدا بەبێ ئەوەی دەرکەوێت ئاگاداری بکات و هۆشی پێوە بێت. بۆ ئەم مەبەستە چەند بڕیارنامەیەکی دابوو کە بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێك لە بانك نەبێت بۆ یەکەمجار لە ژیانی کارمەندیدا هاتەوە بۆماڵەوە.

ڕۆژی دواتر ئەو هەر لە ماڵەوە بوو لەو هۆدەیەی کە ڕێك دکتۆر لەکاتی ئیشکردندا لەژێر چاودێری ئەودا بوو هەوڵی نەدەداد بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵ بکات، نەك ئەمە بدۆزێتەوە و ببێتە مایەی نائومێدی. دکتۆر ئەو شتانەی کە بۆی دانرابوو بۆ خواردن و خواردنەوە هەڵیگرت و بەردەوام مایەوە لە سەر کارەکەی هەتا تەواو هەوا تاریك بوو کەئیتر نەدەبینرا. کاتێ کەکەرەسەکانی وەك شتێکی بێکەڵك دانا، مستر لۆری هەستا و بە دەنگێکی سروشتی وتی: ((ئەچیتە دەرەوە؟)).

دکتۆر هەستایەوە ڕوانی بووی و بە سووکێ دووپاتی کردەوە: ((دەرەوە؟)).

((بەڵێ، بۆ ئەوەی لەگەڵ من پیاسە بکەیت، بۆچی نە؟)).

دکتۆر هەوڵینەدا بۆ ئەوەی هۆی نەچوونە دەرەوەی خۆی بڵێت. هەر دوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی خۆی و بە سەر ئەژنۆوە دانیشت. وادیار بوو بە شوێن وەڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێ ((بۆچی نە؟)) بەڵام هیچی زیاتری نەگوت.

ئێوارەی داهاتوو کاتێك کە هەوا تاریك بوو مستر لۆری وەك جاری پێشوو لێی پرسی: ((دکتۆری خۆشەویستم، دەچیتەدەروە؟)).

وەك جاری پێشوو وەڵامی دایەوە ((دەرەوە؟)).

((بەڵێ. بۆپیاسە لەگەڵ مندا. بۆ چی نە؟)).

ئەم جارەکە ئەو لە وەڵامدانەوە خۆی پاراست، مستر لۆری هەستایە سەر پێ و بە نیازی هاتنەدەرەوە بە تەنیا هاتە دەرەوە. بەڵام چوو بۆ ئەو هۆدەیەی کە هەموو

ڕووداوەکان لەژێر چاودێری ئەوان بوون. دکتۆر هەستایە پێ و چوو بۆ لای پەنجەرەکە و بۆ یەك جار سەیری دەرەوەی کرد. کاتێك کە زانی مستر لۆری گەڕایەوە و ڕۆیشتە دواوە بۆ سەر قەنەفەکە.

نۆ ڕۆژ مستر لۆری هەر لەماڵەوە مایەوە. ئەمە کاتێکی دوودڵی و دڵ لە دوایی بوو بۆ ئەو، لەبەر ئەوەی کە ئەو بەرپرسی بۆ ئەوەی کەئەم هەواڵەی بەلویس نەگەیاندووە، هەر وا لای خۆی شاردوویەتییەوە.دیارە بەم بۆنەوە لویسیش قەت لە خۆی نابووری.

دەستەکانی دکتۆر بە شێوەیەکی سەر سورهێنەر بەم کارەفێر بووبوون لە بەر ئەوەی لە مێژ بوو عادەتی گرتبوو بەم کارە. ئێوارەی نۆهەم مستر لۆری ئەوەنە سەیری دەستیکرد چاوی رمۆڵەی کرد و بە سەر کورسییەکەوە خەوی لێکەوت. تا بەیانی هەڵنەستایەوە. بەیانی تیشکی هەتاو کە لە پەنجەرەکەوە هاتە ئەم دیوە خەبەری کردوو بەلایەوە عەجیب بوو کە لە سەر پێخەفەکەی نەبوو. هەستا و چوو بۆ هۆدەکەی دکتۆر و روانی وەك ئاسایی جلی کردبووە بەری و مێزەکە و کەرەسەی کار پێکردنەکان خرابوونە ئەولاوە.

مستر لۆری بێدەنگ هاتە دواوە و چوو بۆلای پرووس خانم بۆ هاوبیری کردن. بڕیاریاندا لە سەر ئەوەی کە هیچ نەخەنە رووی دکتۆر و هیچی پێ نەڵێن و چاوەڕوانی ناشتا بن و لەو کاتەدا خۆش و چلۆنی لەگەڵ بکەن وەها کە ئەڵێی هیچ رووی نەدا بێت.

ئەمەشیان کرد. دکتۆر بەشێوەی تایبەت بانگکرا بۆ ناشتا و هات. دەربارەی شتێکی تایبەت نەدوان. بەڵام کە ویستیان بە رێکەوت بیر کەنەوە کە چ رۆژێکە و چەند شەممەیە دیتیان کە ئەو خەریکە حساب دەکات بۆیە نارەحەت بوو. لەوە دوا مستر لۆری ویستی داوای دەوا و دەرمان بۆ خۆی بکات دیارە ئەو کەسەی کەداوای لێدەکات خودی دکتۆرە.

ئەوسا کە قاپ و قاچاخی ناشتا کۆ کرانەوە دەستیکرد بەهاودەردی کردن: «دکتۆری خۆشەویستم من ئێستاش دڵم ها بە نەسیحەتەکانی تۆوە لە چەند قۆڵێکەوە کە خۆم حەزم لێیەتی و ئەمەوێ دەربارەی دۆستێکی خۆشەویستم نەسیحەتم بکەی.

لە بەر خاتری ئەو نەسیحەتم بکەوە لە بەر خاتری کچەکەی)).

دکتۆر بە دەنگێکی نزم وتی: ((بچۆ ناو جەرگەی باسەکە بزانم چی دەڵێیت)).

مستر لۆری وتی: ((ماوەیەکی زۆر لەمەو پێش دۆستێکم لەرزێکی گەورەی لێکەوت و لە سەر مێشکی کاری دانا. ئەو خۆی نەیدەزانی چ ماوەیەك بەو نەخۆشییەوە مایەوە، بەڵام ئێستا ئەو چاك بۆتەوە. خۆشی نەیدەزانی چۆن چاك بۆتەوە. بە داخەوە لەم دوایانەدا دوو چاری ئەو نەخۆشینە بۆتەوە)).

دکتۆر پرسیاری کرد: ((چەندوەختە؟)).

((نۆ شەو و نۆ رۆژ دەبێت)).

((ئەی کچەکەی زانیویەتی بەم باسە؟)).

((نە بەهیوام هەرگیز نەزانێت وەك نهێنییەك لێمان شاردۆتەوە. ئەمە هەر لای خۆم و یەکێکیتر ئاشکرایە کە ئەویش لەوانەیە دۆستی خوی بێت)).

دکتۆر دەستی خۆی گەست و ئەمەی زەرمزەمە دەکرد: ((ئەوە نیشانەی خۆشەویستی ئێوەیە سوپاس)).

بەم شێوە مستر لۆری زانی کە هاتۆتەوە سەر هۆش و ئیتر هیچی نەگوت بۆیە: ((ئێستاش دکتۆری خۆشەویستم من پیاوێکی کاسبم. بە شێوەی دروست ناتوانم لەگەڵ ئەم مەسئەلەیەدا هەڵس و کەوت بکەم من پێویستیم بە نەسیحەت هەیە تکات لێدەکەم یارمەتیم بدەیت. پێمبڵێ چۆن ئەوە رووی دا؟ هیچ خەتەرێك هەیە لەگەڕانەوەیدا؟ ئەگەر ئەو نەخۆشییە بگەڕێتەوە بەرگری کردنی هەیە؟)).

دکتۆر بۆ ماوەیەك دانیشت بیریکردەوە.

وتی: ((وا بزان بۆی هەیە کەئەو دۆستەی تۆ ترسێکی لەدڵدا بێت مەترسی گەڕانەوەی بکات.زۆری لێدەترسێ ئەوەندەی لیٚدەترسێ کە تەنانەت توانای درکاندنی لای هێچکەسێکیتر نامێنێت)).

مستر لۆری وتی: ((دکتۆر ئێستا تۆ بزانیت هۆی گەڕانەوەی ئەو نەخوشییە چییە؟)).

ئەوی تریش وتی: ((وابزانم هۆکەی ئەوەیە لەکوتاپڕدا بیرەوەری شتێ کە ئازاری

داوە و یەکەمجار بۆتە هۆی نەخۆشییەکەی ئەو دێتەوە بیری)).
((ئەی بۆ داهاتوو چۆنە؟)).
دکتۆر خێرا وەڵامی دایەوە: ((بۆ داهاتووش من ئەبێ هیوادار بم. هەر ئەو نەهاتە سەر خۆ بە خێرایی چاك دەبێتەوە. ئیتر دووبارە کاریگەری لە سەر دانانێت چونکا ئەوەی کە ئەو لێی دەترسا روویدا و تەواو بوو بەدبەختییەکە رابورد)).
((باشە، ئەمەش دڵنیایەکی زۆر گەورەیە. زۆر سوپاس گوزارم)).
وەك سەری بۆ دۆعا کردن لە خوا بەرز کاتەوە وتی: ((منیش هەر زۆر سوپاسگوزارم)).
بەم جۆرە موشکیلە تەواو بوو. رۆیشتنە دەرەوە بۆ ناو ئاوای بۆ رابواردن چەند رۆژێك بە خۆشی دکتۆر جوان چاك ببووەوە لەماوەی ئەو سێ رۆژەی تردا سەلامەتییەکەی جارانی بەدەستهێنایەوە. لە رۆژانی چواردەیەمدا چوو بۆ لای لویس و مێردەکەی بۆ چاوپێکەوتنیان.
شەوی هەمان رۆژ کە ئەو ماڵەوەی جێهێشت. مستر لۆری بە هەندێ کەرەسەی دارتاشییەوە رۆیشت بۆ ماڵی دکتۆر. لەوەی دەنگی برِینی مشار و قرتاندن و شکاندن دەهاتە دەرەوە پاشان دەستیکرد بە کێشانی داری ورد کراو بەرەو زۆپاکە هێنای. دارەکەی خستە ناو زۆپاکەوە و ئاگریدا، بڵێسەی ئاگر بەرز بووەوە کە نیوەی تەواو بوو کەوشەکان و لەتە چەرمەکان و ئەو شتانەی کەدکتۆر پینەچیەتی پێدەکرد دوا بە دوای دارەکان خرانە نێو ئاگردانەکەوە. پاشان مستر لۆری لەناو باخچەکەدا قوڵۆتێکی کەند و خاتوو پرووس کەرەسەی پینەچییەتییەکەی فرێدا ناوی.
بەم شێوە هیچ ئەسەرێك لە پینەچییەکەی پاریس نەمایەوە.

## - ١٣ -

# شۆڕش

ئەودەمەی کە لویس و مێردەکەی گەڕانەوە  بۆ ماڵ. ئەو کەسەی کە سەردانی ماڵیانی کرد سایدنی کارتۆن بوو. ئەمەش ماوەیەك رابورد ئەو هەر لەوێ وەك سەردان مایەوە. ئەو یەکێك بوو کە هەموو جارێك سەردانی ماڵی ئەوانی دەکرد ساڵێك شەش جار دەهات. هەر کە ماوەیەکی پێچوو ماڵەکە بە دەنگی شاد و پێکەنینی منداڵەوە قەرەباڵخ بوو. ئەمەش جێگەی سەرنج بوو کە لەوانەیە لویسی هەژار سەردەمێ سایدنی کارتۆنی خۆشویستبێت بۆیە ئاوا خێرا خێرا دێت بۆ سەردانی هاوڕێکانی.

یەکێکیتریش لەوانە کە بەردەوام سەردانی دەکردن مستر لۆری بوو. شەوێکیان لە نیوەی جولایی ١٧٨٩ دا درەنگان بوو خۆی کرد بە ژوورەکەدا کە لە تیلسۆنەوە هاتبوو لە پشتی پەنجەرەیەکی نەبینەوە لە پاڵ لویس و مێردەکەیدا دانیشت.

وتی: ((کە بیر دەکەمەوە ئەبێ بە تاریکە شەو، لە تیلسۆن دەربچم. بە درێژایی رۆژگار و بارێکی زۆرمان دەبێت بە جۆرێك کە نازانین یەکەمجار کامیان ئەنجامبدەین. ئەمەش وەك ئەو مەترسییەی پاریس وایە. خەڵك پارەکانی خۆیان دەخەنە بەردەستی ئێمە و دەینێرن بۆ ئینگلتەرا تا ئەو جێگەی بۆیان دەگونجێ)).

دارنی وتی: ((ئەوە نەشەمەی خراپە)).

((بەڵێ بەڵام ئێمە هۆکەی نازانین. ئەوە کوا مانێت؟)).

لەم کاتەدا دکتۆر هاتە ناو ژورەکەوە و وتی: ((ئەمە تام. یاری وەرەقەم لەگەڵ دەکەیت؟)).

((لەو قەناعەتەدا نیم ئەم شەو یاریت لەگەڵ بکەم. تەواو هیلاکم بەڵام حەز لە چایی دەکەم. ئەگەر لویس بمنداتێ)).

لویس وتی: ((هەڵبەتە)).
((سوپاس خۆشەویستم، ئەی منداڵەکەت بە سەلامەتی خەوتووە؟)).
((بەڵی، خێرا ئەخەوێت)).
((زۆر راستە هەموو باش و سەلامەتن نازانم بۆچی نابێ هیچ شتێك لێرەدا باش و سەلامەت بێ. ئەی خوا تۆ شوکر. بەڵام ئەوەندە گیر و گرفتم هەیە بەم رۆژگارە خۆم لە بیر چۆتەوە. گەنجییەکەی جارانم نەماوە! چایەکەم. خۆشەویستەکەم! سوپاس ئێستاش با بە هێمنی دانیشین و قسە بکەین)).
هەمان رۆژ دوورتر لەوێ لە شەقامی ئانتۆینە دەنگی داخورین و توڕیەکی مەزن لە قورگی ئەو خەڵکانەی کە وەك هەردێکی چر و پڕ لە قۆڵو بازووی بەهێزی بەرخۆدان کە بە توڕەیی رەشەبای زستانان بەرەوێزەی لق و پۆپی دارستان دەبێت و بەرز دەبێتەوە. هەموو دەست و پەنجەکان پڕ لە چەك بوون، چەك تفەنگ کوتەك دارین و ئاسنین. خەنجەر و چەقۆ. تەور و پاچ، یان هەر شتێکی تیژی هەڕەشە پێکردن و قرتاندن.
ئەو خەڵکانەی کە نەیانتوانی شتیتر بە دەستەوە بگرن هاشاوڵیان دەهێنا بۆ دار و بار و دیوار و زۆریان لێدەکرد تا ئەو رادەیەی کە خوێن لە دەست و پەنجەیان دەهات. مەرکەزی ئەم خەڵکە رقاوی و توڕە دوکانەکەی دیفارج شەرابفرۆش بوو. لەوێدا دیفارج خۆی لە دووکەڵ و باروتدا رەش بووبوو ئارەقەی کردبوو شاخەی دادەڕشت و دەستووری پێدەدان.
قیڕاندی: ((جاکیۆسی سێیەم نزیك بەرەوە لێم. ئێوەش جاکیۆسی یەکەم و دوەم. بە جیا، جیا هەر یەك بن بە سەرپەل بۆ نیشتمانپەروەرەکان تا ئەو جێگەی ئەتوانن ئەی کوا ژنەکەم؟)).
ئەویش وەك هەمیشە بە هێمنی کە ئەم جارەیان خەریکی دوورین نەبوو. وتی: ((ئامە لێرا. لەگەڵتا دێم و حازریشم. بەم زووانەش من لە پێشەوەی ژنان دەبینیت)).
دیفارج قیڕاندی: ((وەرن. هاوڕێیان و نیشتمانپەروەران! ئێمە ئامادەین بەرەو باستیل بڕۆین!)).

وەك دەریای زیندوو دەنگی هەڵمەت بەرز دەبووەوە. بە پۆل خەڵکی شار بووبە هاوڕێیان بەرەو شوێنی دیاریکراو. ئاگر و دوکەڵ خێرا دیوارە ئەستوور و بەردینەکانی داپۆشی هەروەها هەشت بورجی گەورەش. دیفارج لە نێوان بلێسەی ئاگر و دووکەڵدا هەر خەریك بوو هاواری دەکرد: ((هاورێیان خەریك بن. جاکیۆس یەك. جاکیۆس دوو. جاکیۆس سێ جاکیۆس هەزار، جاکیۆس بیست و پێنج هەزار. هەڵمەت بەرن دژی هەڵمەت بەران)).

مادام مێردەکەی بانگکرد: ((وەرە، ئێمەش دەتوانین وەك پیاوەکان بۆ گرتنی کۆشکەکە شەڕ بکەین و بکوژین)). ژنێك هات بۆ لای، بە شێوازی جۆراوجۆر خۆی پڕ چەك کردبوو، کە هەر شێوەیەك چەك هەڵگرتن بۆ تۆڵەی برسیەتی بوو.

لە پڕ ئالآیەکی سپی لە ((باستیل))ەوە هەڵکرا، و لە پڕ دیفارج خەڵکەکەی هاندا بۆ گرتنی ئەو مەتەریزەی کە دەوریان گرتبوو. ئەو مەجالی هەناسە کێشان و پشوودانی نەبوو تەنانەت نەیدەتوانی سەر وەرگێڕێ. کاتێکی زانی وا لە ناو حەوشی دەرەوەدا. هەموو جێگەیەك قەرەباڵغ و قیرە و تەقەی خۆشی بوو.

((زیندانییەکان!)).

((گیراوەکان!)).

((بەشە نهێنییەکان!)).

خەڵك خێرا ئەفسەرانی زیندانەکەیان گرت و هەڕەشەی مەرگیان لێکردن ئەبێ هەر کامیان بەشە نهێنییەکانی زیندانەکانیان نیشانبدەن. دیفارج خۆی یەکێکیانی گرتبوو.

دیفارج وتی: ((بورجی باکوورم نیشانبدە. دەی خێرا کە!)).

کابر وتی: ((من وەفادارم، پێتان دەدەم ئەگەر بێن لەگەڵم بەڵام کەسی لێ نییە)).

((مانای سەد و پێنج، بورجی باکوور چییە؟)).

((هۆدەیەکە)).

((نیشانم بدە)).

((کەواتە لێرەوە وەرە)).

بە ناو هەیوانە بەردینەکاندا کە بە هیچ شێوەیەك تیشکی هەتاوی لێنەدەکەوت بە ناو دەرگای ناشیرین و کۆنە هۆدەی بچکۆلەدا و بە ناو پلەکانە خوساوەکاندا تێپەڕیان کرد. دیفارج و جاکیۆس سێ کە لەگەڵیدا هاتبوو، ئەفسەری زیندانەکەری نوێنی دەکردن.

وەك بەدوای قەرزدا بگەڕێت سەرنجی دیوارە ئەستوورەکانی دەدا. دەنگی تەقە و لێکدان دوور کەوتەوە نەما.

پیاوەکە لەبەردەرگایەکی بچکۆلەدا راوەستا. کلیلێکی کردە ناو کێلونەکە و هێۆاش پاڵی پێوە ناو دەرگاکەی کردەوە. ((یەك سەد و پێنج، بورجی باکووری!)).

پەنجەرەیەکی بچکۆلەی تێدا بوو. کە بەئاسن تولێکێش کرابوو. بەڵام شیشەی تێدا نەبوو زۆر بەرزیش بوو. لوولە زۆپایەکی زلەی تێدا بوو کە ئەویش هەر تولێکیش کرا بوو. قەنەفەیەکی بچکۆلەی دارینی تیا بوو لەگەڵ یەك مێز و جێگەیەك بۆ نوستن. چوار دیوارییەك تاریك و رەشی لێبوو کە چەند حەڵقەیەکی ژەنگ هاوردوی تێدا بوو.

دیفارج وتی: ((شەوقەکە بگێڕە بە دیوارەکەدا، لەوانەیە بیان دۆزمەوە)).

پیاوەکە بە گوێی کرد.

((راوەستە! جاکیۆس سەیری ئێرا بکە)).

جاکیۆس خوێندییەوە: (( ا.میم)).

لە بەر خۆیەوە دیفارج وتی: ((ئەلکساندەر مانێت خۆ لێرەشدا نووسراوە دکتۆرێکی هەژار. ئەو میلە ئاسنینەم بدەرێ!)).

دایهێناوە بۆ قەنەفە دارینەکە و مێزەکە و بەچەند لێدانێك لەتیکردن..

((جوان سەیری لەتەکانی بکە جاکیۆس. جوان بگەڕێ! ئەمە چەقۆکەی من. ئەو پێخەفە بدرێنە و ناو پووشەکەی بگەڕێ. تۆش چراکە بەرز بگرە بۆمان)).

دیفارجیش خۆی ناو لوولە زۆپاکە گەڕا. هەندێ دۆرژنگ و پیس و چەپەڵی هێنایە دەرەوە بە پەنجەکانی جوان گەڕا تەنانەت ناو ئاگردانە کۆنەکەش کە لە خوارەوە بوو هەر گەڕا.

((جاکیۆس، ناو وردە دارەکان و پلوپووشەکان هیچی تیا نەبوو؟)).

((نەهیچی تیا نەبوو!)).

((دەی با هەمووی کۆ بکەینەوە. تۆش ئاگریان بە)).

پیاوەکەش ئاگری پێوەنا و جێیانهێشت با بسوتێن. ئیتر لـە دەرگـا بـچکۆلەکە وە هاتنە دەرەوە. ئاوا گەڕانەوە بۆ ناو حەوشەکە هاوار کردن دەستی پێکرد.

خەڵکەکە کارگێڕی زیندانەکەیان گرتبوو هەر بەرەو دادگایی کردن لێیان دەخوڕی. مادام دیفارجیش لەنزیکیدا بـوو. هـەر ئەونـە مێردەکـەی دەرکـەوت بـانگی لێکـرد. کاتێك کە فەرماندەی زیندان لەنزیکیدا بە سەر شۆڕی وەستابوو لە دواوە لێیـان داو و نیوە مرد و درا بە زەویدا و خاتوونەکە خێرا پێی نا سەر فێری ملی و سەری بڕی.

بەم شێوە شۆڕش دەستیپێکرد و هەرواش درێژەی پێـدرا رۆژی شـەقامی ئانتۆینـە هاتە پێش و شەقامیش توڕە بوو. پیاوێك لـە بـەکرێ گیراوەکانیـان بـەداری رۆشـنایی شەقامەکاندا هەڵواسی. زیندانەکانی زیندانی باسـتیلیان ئـازاد کـرد و پیـاوە رەمـەق رۆیشتووە زیندانییەکانیان بەسەر شانەوە هێنایە ناو شەقام. بە گشتی لە رقی ئـەوەی ئەوان ئێشیان پێ گەیشتبوو لە رەنـج و عـەزابـدا چەوسـابوونەوە. نائومێـدیان هەسـت پێکردبوو نەیان دەتوانی نیشانەیەکی لە خۆشی بدرکێنن بۆیە رەحم لە دڵیان نەمابوو.

- ١٤ -

# تەواو بوونی قەڵای چاتێوۆ

ئـەو دێیـەی کـە گاسـپیردی تیـا کـوژرا دێیـەکی هـەژار بـوو. بـە چـواردەوریدا حەوشەیەکی وێرانە بوو. هەموو شتێك لە کۆنـە و پـەك کـەوتوو دەچـوون. ماڵـەکان، نەردەکان، حەیوانەکان پیاوەکان، ژنەکان و منداڵەکان تەنانەت ئەو خاکەی کـە ژیـانی پێ بەخشی بوون.

بۆ ماوەی چەند ساڵێکی زۆر بوو کە ئەم دواییانەی بنەماڵەی مارکۆس پارەیـەکی هەرە زۆریان چەپاو کرد بوو بە بۆنـەی چـەند بـاجگرێکی وەك ((مانـسیۆر گابـل))ەوە. ئێستا شتێکی وا نەماوە کە لە یادی بکەن بۆیە پشتیوانی لەو خەڵکە هـەژارەوە کـە لە وێیدا دەژین زۆر سەخت و دژوارە.

خەڵك هەر ئەو خەڵکەیە کە بیریان دەکـردەوە مـارکۆس رۆیـشتووە. لـەکـۆی ئـەو خەڵکەدا چەند لاوەکییەك لەو دێیەدا دەژین. ئەو چـەند کەسـەی کـە ئـیش و کاریـان ببووە فێرکردنی خەڵك لە بیر و بۆچوونی نوێ بۆ ئەو کاتـەی کـە بـیری نـوێ پێویـست دەبێت.

زیندانی سەرگردەکە هەر ئەوەیە کە گاسـپێردیان بـرد بـۆ کوشـتن. ئێـستاش هـەر سەربازی تێدایە کە ئەفسەرەکان ئـەمریان پێدەکـەن. بـەڵام یـەکێك لـە ئەفـسەرەکان ئاگای لە پیاوەکانی نەبوو کەچی دەکەن تەنانەت هەندێ جاریش کـە ئـەو دەسـتووری پێدەدان ئەوان ئیشێکی تریان دەکرد. بیری نوێ لە پاریسەوە بۆ شارەکانیتریش پەرەی سەندبوو لە شارەکانیشەوە بۆ لادێکان، ئێستاش گەیشتۆتە نێو سەربازەکان.

دروستکەری رێگە و بان ئیستاش هەر بەردەوام لە سەر ئیشە کۆنەکەی ماوەتـەوە ئەگـەر چـی ئـەو گەڕاوەتـەوە بـۆ زەحمـەتکێـشانەکەی خـۆی بـە گـوێرەی خـۆی پێـی راگەیاندراوە کە ئەو زیندوو خـۆی راگرێـت. هەنـدێ جـار کـە کـاری دەکـرد، بـە نـاو

لاوەکییە تورەکاندا پێڵاوی دارینی لە پێدەکرد. خۆی موسەلەح دەکرد و بە پێ تێدەپەڕی. ئەم لاوەکیانە بیری نوێیان بە ناو وڵاتدا پەرە پێدەدا کە لە لایەن ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکانیانەوە لە پاریس ئەمریان پێ دەکرا.

ڕۆژێکی جولای لاوەکییەك لە سەر ئەو ڕێگە کە بەرەو گردەکە دەچوو لە ئاواییەوە خۆی لە دروستکەری ڕێگە و بان نزیککردەوە. پیاوەکە سەیری دروستکەری ڕێگە و بانی کرد، سەیری خوار ئاوایی کرد، ڕوانی بۆ کلێسا و بۆ زیندانەکەش کە وا دیار بوو ئەوەی کە بە ئەو دواییەدا دەگەڕا دۆزیبێتیەوە.

وتی: ((جاکیۆس وەزعەکە چۆنە؟)).

پیاوەکە قنی نایە سەر بەردێك. ((هەموو باشین جاکیۆس)).

((نانی ئێوارەنییە؟)).

دروستکەری ڕێگە و بان وتی: ((هیچ نییە بەڵام ئێستا شۆربا هەیە)).

پیاوەکەش وتی: ((دەی خۆ ئەوە لە هەموو شوێنێك هەیە. من چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا هەیە کە هەر هیچیان نییە لە هیچ کوێیەك)).

سەبیلێکی ڕەشی هێنایە دەرەوە. پڕی کردەوە. ئاگری دا، و پاشانیش لە پەسا مژی لێدا هەتا سەری سەبیلەکە سوور بووەوە. سەبیلەکەی لە دەمی سەند و بازێ شتی تێکرد. گڕێکی بچووکی لێ هەڵسا و چووە دەرەوە.

دروستکەری ڕێگە و بان هەستیکرد بە ئیشارەتێك کە نیشانەیەکی تێدا بوو.

دروستکەری ڕێگە و بان وتی: ((ئەم شەو؟)).

((ئەم شەو، کەسانی تریش دێن بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ مندا، کوا شوێن؟)).

((لە گوێ ڕێگەکەدا لە دەوری پێنج مایل بەرەو ئاوایی)).

((باشە، کەی تۆ دەست لە کار ئەکێشی؟)).

((کاتی خۆرئاوا)).

((خۆ پێش ئەوەی بڕۆی من لە خەو هەڵدەسێنی؟ من بێ ئەوەی پشوو بدەم دوو شەو ڕێگەم بڕیوە. بیەڵە با سەبیلەکەم بکێشم جا وەك منداڵێك دەخەوم. لە بیرت نەچێ خەبەرم بکەیتەوە)).

پیاوە لاوەکییەکە سەبیلەکەی تەواو کرد و خستییە لاوە. پێڵاوە دارینەکانی داکەند و بەپشتی خۆی خست بە سەر فرە بەردەکاندا و خێرا خەوی لێکەوت.

ئەو دوانیوەڕۆ بە تەواوی خەوت. کاتێك کە خۆر گەیشتبووە ئاوا بوون، لە خۆرئاوادا و لێواری ئاسمان سوور بووبوون دروستکەری ڕێگە و بان کەرەسەکانی خۆی کۆ کردەوە و ئەویشی لە خەو هەڵساند.

خەوتووەکە هەستایە سەر ئەژنۆ وتی:«باشە. پێنج مایل لە خوارووی ئاواییدا؟».

«لەو دەورەدا».

دروستکەری ڕێگە و بان ڕۆیشتە خوارەوە بۆ ئاوایی خێرا چووە سەر کانییەکە ئەو شوێنەی کە ئاژەڵەکان تێدا ئاو دەدرا. چپەیەکی کرد بۆچەند کەسێکی ئاوایی ئەوانیش بۆ چەند کەسێکیتریان گێڕایەوە، لەم دواییانەدا کە خەڵکی ئاوایی شۆرباوە هەژارانەکەی خۆیان دەخوارد ئیتر نەدەچوونە ناو جێگە بۆ خەوتن. بەڵام دەهاتنە دەرەوە بەدەور کانییەکەدا دەستیان دەکرد بە چپە کردن. لە کاتی چپە کردندا هەموو چاوەکان بەرەو عاسماندا گەڕان بەڵام هەموو بۆ یەك شوێنیان دەڕوانی.

مانسیۆر گابل تازە ئارام بووەوە ئەویش ڕۆیشتە سەر بانیماڵەکەی خۆی هەر وا وەك ئەوان بۆ ئەو شوێنەی ڕوانی بانگیکرد لە ئەو کابرای کەکلیلی کلێساکەی هەڵگرتووە. با بڕوات زەنگی کلێساکە لێبدات بۆیە لەوانەیە پێویست بێت.

تاریکی داهات. با هەڵیکرد ئەو دار و درەختانەی کە بە دەوری قەڵاکەدا بوون لە بەر باکەوە دەستیان بەجووڵە کرد و سەریان دادەنەواند و نووکیان دەدا لە خانووە بەرزەکەی قەڵاکە.

چوار قەیافەی زەبەلاح ڕێیان خستە ناودارەکان و خۆیان هەڵدایە ناو حەوشەکان. چوار چرا هەڵکرا و هەر یەکە و لە شوێنێکەوە ڕۆیشتن. پاشان دووبارە تاریك بووەوە.

بەڵام زۆری نەخایاند کە بە خێرایی دەرکەوت قەڵاکە ئەیەوێت خۆی بە بۆنەی ئەو تیشکە نامۆیانەوە کە لە خۆی دەردەکات خۆی بنوێنێ. پەنجەرەکان گڕیان لێ بەرز بووەوە. دووکەڵ هەڵسا و بڵێسە هاتە سەرەوە تا بێ پەرەی سەند و دنیا ڕۆشن بوو.

خێرا پانتایی پێشەوەی قەڵاکە دەرکەوت لە ناو قرمەی سوتاندا.

لە ناو ئاواییەوە ڕۆشنایی دەردەکەوت. بە پەلە پیاوێکی ئەسپ سوار بە ناو تاریکیدا بەغار هاتە دەرەوە کە لە دەرگای مانسیۆر گابلەوە دەرباز بوو.

((کۆمەك.. گابل! کۆمەك، هەر کەسی تر!)).

زەنگی کلێساکە لێدرا بۆ ئەوەی خەڵك بێن بۆ هاوار بەڵام کەس نەجووڵایەوە.

دروستکەری ڕێگە بە دووسەد نەفەر لە هاوڕێ چاکەکانیەوە خۆیان بە سەر چەکەکانیانەوە چەماندبووەوە لە باوەشیان نابوو لەپاڵ کانییەکەدا، سەیری پزیسك و بڵێسەی ئاگریان بە ئاسمانەوە دەکرد.

یەکێك پێدەکەنی وتی: ((بڵێسە چل پێ بەرز بۆتەوە)). کەس چورتەی نەکرد.

سوارەی قەڵاکە (چاتێوۆ) بە غار بە ناو ئاواییدا تێپەڕی و ڕۆیشت بۆ سەرگردەکە بۆ زیندانەکە. لە دەم دەرگای زیندانەکەدا چەند ئەفسەرێك ڕاوەستابوون سەیری بڵێسەی ئاگریان دەکرد. مەسافەیەك لەولاترەوە چەند گرووپێکی سەربازیش هەر خەریکی سەیرکردن بوون.

((دە جوامێرەکان، کوڕینە ئادەی یارمەتی بدەن. قەڵاکە ئاگری تێچووە دەی فریا کەون شتە بە نرخەکان ئەبێ لە بڵێسەی ئاگر بیانپارێزن. دەی فریا کەون)).

ئەفسەرەکان سەیری سەربازەکانیان کرد کە خەریکی سەیری ئاگر بوون. هیچ ئەمرێکیان پێنەکردن ئەیانزانی کە بە گوێیان ناکەن. وەڵامیان دایەوە: ((با بسوتێ)).

قەڵا کەوتە بەر بڵێسەی ئاگر و کەس فریای نەکەوت. کزەبا باوەشێنی ئاگرەکەی کرد. زۆری نەخایاند کۆی هەموو بەرد و دار داڕوخا دار و دەوەنە نزیکەکان بە گەرما هەڵقرچان و گەڵاکانیان هەڵوەری و دەستیان کرد بە دووکەڵ کردن. هەندێ لە پەلەوەرەکان بەو دەوردا هەڵفڕین و بە سەر گڕ و دوکەڵدا زاڵبووبوون. گەرما زۆری بۆ دەهێنان و ناچار دائەکەوتن و ئەبرژان. چوار پیاو پێیان هەڵگرت و بە شەو بە لای باکوور و باشوور ڕۆژهەڵات و ڕوژئاوا بەرەو قەڵای تر هاتن. ڕۆشتنە خوارەوە بۆ ناو ئاوایی و دیسان زەنگی کلێساکە لێدرایەوە. بەڵام ئەم جارەیان بۆ ئاگادار کردنەوە نەبوو. ئەم جارەیان بۆ خۆشی بوو. نەك تەنانەت هەر بۆ ئەوە. خەڵکی ئاوایی حەزیان لە ئاگرەکە بوو، بە لێدانی زەنگی کلێساکە بۆ برسیەتی بیریان دەکردەوە. مانسیۆر

گابل كە لەو زەنگە بۆ كۆكردنەوەی باج و خەراج و ماڵیات کەڵکی وەردەگرت ئەگەر چی باج و مووچە کەمیش بوو بەڵام هەموو جار كۆی دەكردەوە. ئەمجارە دەوری ماڵەكەیان گرت بانگیان لێكرد بێتە دەرەوە. سەرەڕای ئەوەی كە »گابل« دەرگاكانی چاك داخستبوو لەپشت لوولە زۆپاكانەوە. خۆی حەشاردابوو.

پیاوێكی بە خیرەت لەوێ بوو، بڕیاریدا ئەگەر دەرگاكەی بۆ ئاوەڵا كەن ئەو یەكەم كەس ئەچێتە ژوورەوە یەك سەر ئەچێتە سەربانەكەیان ئەگەر یەك دوو كەس یارمەتیبدات دەچێت و بە خۆیەوە دووانی دیكەش دەبات؟.

هەستی حەماسی لادێیەكان خێرا مرد، كاتێك كەتیشكی هەتاوی سەر لەبەیانی لە ئاسمانەوە دەركەوت خەڵك ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵەوە. مانسیۆر گابل دیسان هاتە خوارەوە. بۆ خۆی سوپاسگوزار بوو كە هێشتا زیندووە.

ئەو شەوە و چەند شەوێكی دیكەش، كاربەدەستە ڕەسمییەكان لە گوندەكانی تریشدا تا ئەو كاتە هیچ كامیان بە قەد مانسیۆر گابل شانسیان نەبوو. بەیانیان تەرمەكانیان بەهەڵواسراوی لە جەنگەڵە بێدەنگەكاندا دەدۆزرایەوە. لە هەندێ لە گوندەكانیشدا سەربازەكان دەهاتنە خوارەوە بۆ گیانی خەڵك و لە ئاكامدا چەن كەسێكیان لێدەكوشتن و هەڵیان دەواسین. بەڵام هەر شوێنێك كە چوار پیاوەكە دەچوون، باكوور، باشوور، خۆرئاوا، خۆرهەڵات هەموو سووتابوون. مەترسیش هەموو شەوان بەردەوام بوو.

## - ١٥ -

# كاسبی لە پاریسدا

هەڵبەتە شوێنی چاوپێکەوتن بۆ هەموو ئەو نەجیبزادانەی کە لەپاریسەوە هەڵاتبوون، بانکی تیلسۆنەکان بوو لە لەندەندا. ئەوانەی کە بیرێکیان لە داهاتووی خۆیان دەکردەوە بە مەبەستی کاسبی کردن، بۆیە لە شۆڕش دەرچوون پارەکەی خۆیان دەنارد بۆ ئینگلتەرا. ئەوانەش کە ئەو ئیمکاناتەیان نەبوو دەچوون بۆ لای دۆستەکانیان بە هیوای ئەوە کە بتوانن بە بۆنەی ئەوانەوە خۆیان رزگاربکەن یان داوای یارمەتییەکیان لێبکەن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیان. بانکی تیلسۆنەکان بووبوو بە سەرچاوەیەکی خەبەری کە هەر کەس ئەهات بۆ ئەوێ بۆ بەدەستهێنانی هەواڵێك دەربارەی فەرەنسە. ئەمەش بۆ هەموو کەس روون بوو کە زۆربەی لێکوڵینەوەکەان لەوێ دەکران. وەلـحاسڵ، هەواڵ و دەنگ و باسەکانی فەرەنسە بازێ رۆژ دەنووسران و بە پەنجەرەی بانکەکاندا دادەکوتران لە بەر ئەوەی کە خەڵك ئاگادار بێت.

دوانیوەڕۆیەکیان، نیو سەعات پێش ئەوەی بانك دابخرێت، مستر لۆری لە سەر مێزەکەیدا دانیشتبوو و چارلز دارنیش بە پێوە دانەوی بۆ بە دەنگی هێواش قسەی بۆ دەکرد.

مستر لۆری وتی: ((تۆ وا بیر دەکەیتەوە ئەمن ئەوەندە پیر و پەك کەوتووم بۆ رۆیشتن؟)).

((جەوەکە نائارامە، سەفەرێکی درێژخایەن، سەفەر بۆ شوێنێکی نامۆتمەئینە، شارێکە لەوانەیە قەت هێمن نەبێت)).

((چارلزی خۆشەویست، بۆ من بە ئەنازەی پێویست ئارامە. کەسێ دەردی سەری پیاوێکی هەشتا ساڵە نادات. لەکاتێکدا خەڵکیتر زۆرن کە ئەبێ سزا بدرێن)).

سەرەڕای ئەمەش، پێویستە بۆ ئەو کەسەی کە لە بانکی ئێرە مانەوە دەچێت بۆ

بانکی ئەویّ، ئەبیّ کەسێك بێت کەشارەزای ناو شار و کاسبیش بێت. لە بەر خاتری تیلسۆنیش بێت پاش ئەو هەموو ساڵە کە کارمکردووە، ئەبیّ هەر بڕۆم)).

وەك پیاوێك کە بیری بەرزی هەبێت. دارِنی وتی: ((شەللاّ منیش بۆ خۆم بچوو مایەت)).

((بە راستی! تۆش ئارەزووت بوو کە بڕۆیت! بەلاّم خۆ تۆ فەرەنسیت!)).

((مستر لۆری خۆشەویست. هەر لە بەر ئەوەیە کە فەرەنسیم. بۆیە هەر وەك بیرۆکێك لەمێشکمدا دێت و دەچێت. هەندیّ جار بیر دەکەمەوە پێموایە ئەتوانم خەڵك هانبدەم بەوەی کە برِیّ بەرگری کردنی خۆیان نیشانبدەن)).

((ئەی لویس چۆنە؟ بە لامەوە سەیرە بۆ خۆت تەریق نابیتەوە، کە ئەڵێی ئەچی بۆ فەرەنسا!)).

دارِنی بە پێکەنینەوە وتی: ((باشە ئیتر نارِۆم بەلاّم خۆ تۆ ئەڵێی ئەرِۆم)).

((بەڵیّ بەراستی ئەمەویّ برِۆم. نابیّ قسەیەکت بێت، چارلز دەربارەی گرفتەکانی ئیشکردن و کار و باری کەسابەت لەحاڵی حازردا. یا خود دەربارەی خەتەری بەڵگەنامە و کتێبەکانمان لە فەرەنسا. لەوانەیە لەچرکەیەکدا بگیرێن و لە ناو بچین. ئەگەر من برِۆم لەوانەیە بتوانم بەشێکی زۆر موهیمیان لە تیاچون رزگار کەم. یان بیان شارمەوە یان بەهەر شێوەیەك بێت نەیەڵم هیچیان لێبێت. بە دەگمەن کەسێك ریّ ئەکەوێت وەك خۆم بیکات. ئەکریّ پاشگەز بمەوە؟)).

((چۆن باسی چاکەت بکەم! کەواتە بەراستی تۆ ئەتەویّ ئەم شەو برِۆیت؟)).

((ئەم شەو، ئێمە ئەبیّ لەمە زیاتر چاوەرِوان نەبین)).

((کەس ئەبەی لەگەڵ خۆت دا؟)).

((بەراستی جێری ئەبەم لەگەڵ خۆم لە بەر ئەوەی کە ئاگای لێم بێت. لەدواییدا کاتێك کە من ئەم کارە بچکۆڵەم کرد. لەوانەیە بە وەرگرتنی ئیسراحەت و خانەنشینی لە تیلسۆنەکان بۆخۆم بژیم)).

ئەموت و وێژە بە سەر مێزەکەی مستر لۆرییەوە بەئاسانی کرا. لەپاڵ مێزەکەدا چەند ئەشرافییەکی فەرەنسی کە بۆ کاسبی هاتبوون راوەستابوون. لە ناو ئەواندا سترایڤریش

بوو. ئەو کەسەی کەخەریك بوو چۆنیەتی راپەڕاندن و هاندانی خەڵکی فەڕەنسای لە لایـەن خۆیەوە شیدەکردەوە. تەواو ئەو شتانەی کە ئەو بە شـێوەیەکی نائـارام دەگێڕایـەوە داڕنـی گوێی لێبوو. هەر لەم قسانەدا بوو کە بەرپرسـی بانکەکـە خـۆی نزیککـردەوە نامەیـەکی هەڵنەچڕاوی چلکنی هەڵدا بۆ بەردەم مستر لۆری. تێدا پرسیار کرابـوو ئایـا تـاکو ئێـستا شوێن پێی ئەو پیاوەی کە ئەدرەسـی درا بـۆ دۆزیتـەوە؟ نامەکـە بـە داخـراوی نرایـە بـەر دەستی کە ئادرەسەکەی پێوە دیار بوو کە پێوە نوسرابوو ((زۆر بەپەلە، بۆ مارکۆس ئـێس تی ئیفرمۆندی پێـشوو لـەفەڕەنـسا ئاگـات لـەو پیاوانـە بێـت. تێلـسۆن و کۆمپانیاکـەی بانکەکان، لەندەن ئینگلتەرا)).

ئەو ڕۆژەی کە زەماوەندەکە کرا، سەر لە بەیانی دکتۆر مانێت داوای لە داڕنی کرد کە ناوی راستەقینەی خۆی بە کەس نەڵێت. تا ئەو کاتەی کە دکتۆر رازی نەبێت. بەم بۆنـەوە هیچ کەسیتر بێجگە لە ژنەکەش و مستر لۆری ناوی ئەویان نەدەزانی.

مستر لۆری بە بەڕێوەبەری وت: ((نە، من پرسیارم لە گشت کەس کردووە لێرەدا بەڵام کەس ناڵێت ئەو پیاوە لەکویّ ّپەیدا دەبێت)).

ئەویش نامەکەی هەڵگرت ئەوانەی کە بە پێوە لەنزیکیدا راوەستابوون دەیانبینی.

یەکێکیان وتی: ((برازاکەی وابزانم لە بنەماڵەی مارکۆسە کە کوژرا. خۆشحاڵم بـەوەی کە قەت نایناسم)).

یەکێ وتی: ((ئەو ترسنۆکەی کە پۆستەکەی خۆی جێ هێشت)).

سێیەمی وتی: ((ئەو پیاوەیە کە بە شێوەیەکی نفوزی بە بیری نوێوە هاتبوو ئـەو هـەر دژایەتی مارکۆسی دەکرد و بۆ خۆشبەختی خەڵك دەستی لە هەموو شتێك هەڵگرت)).

سترایڤر قیڕاندی: ((چی؟ ئەویش یەکێك بـوو لـەوان؟ راوەسـتن بـا سـەیرێکی لیـستەی ترسنۆکەکان بکەم)).

داڕنی نەیدەتوانی لەمە زیاتر بێدەنگی خۆی رابگرێت: ((من ئەو هاوڕێیە دەناسم)).

سترایڤر وتی: ((تۆ! من پەشێوم بـەوەی کـە دەبیـسم، چـاکتر وا بـوو پیـاوی وام قـەت نەناسیبا. ئەو ترسنۆکە ئەگەریش پیاوێکی باشە لێی تێناگەم. لەوانەشە لە لایەن منـەوە ئەوەی پێ بڵێن... پێی بڵێم ئەگەر لە بەر شۆڕش رایکردووە و شوێنی خۆی جێهێشتووە،

من بەلامەوە سەیرە، دڵنیاشم کە ئەندامی سەرەکی نییە. نەك نییە، هەڵبەتە کە ناشبێت. پیاوێکی وا نابێ خۆی بلکێنێ بەوانەوە. بۆ ئەوە باشە هەمیشە راکردووبێت.

لەگەڵ ئەم قسانەدا سترایڤر بە باڵ راوەشاندن رۆیشتە دەرەوە بەدوایدا زۆربەی ئەوانەش کە لە رێیدا بوون گوێیان گرتبوو رۆیشتنە دەرەوە.

دارنی و مستر لۆری بە تەنیا لەوێیدا مانەوە لە پاڵ مێزەکەدا.

مستر لۆری وتی: ((ئوباڵی ئەو نامەیە ئەگرێتە ئەستۆی خۆت؟ ئەزانی بیگەیەنێتە کوێ؟)).

((بەڵێ)).

((بۆم باسدەکەی بۆ ئەمە ئەوەندە لێرە ماوەتەوە؟)).

((پێتدەڵێم. سەفەرەکەت بۆ پاریس لێرەوە دەست پێدەکەیت؟)).

((لێرە و لە سەر هەشتدا)).

((پێش ئەوەی برۆیت سەرت لێ ئەدەمەوە)).

مێشکیان زۆر ئازار دابوو، دارنی نامەکەی هەڵگرت و رۆیشت. هەر ئەوەندە گەیشتە شوێنی، ئەو خێرا نامەکەی دەرهێنا و خوێندییەوە کە بەم شێوە بوو:

بەندیخانەی ((ئەبی))

پاریس

٢١ی ژوئین ١٧٩٢.

مانسیۆر

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر گیانم لە خەتەردا بوو بە دەست لادێیەکانەوە، دەستگیرکرام و بەپێ هێنامیان بۆ پاریس. زۆر لە سەری نارۆم ماڵەکەم بە تەواوی روخێنرا.

ئەو تاوانەی کە منی پێ زیندان کرا بووم، لەبەر ئەوەیە ئەبێ دادگایی بکرێم و ئەبێ گیانیشمی بۆ بەختبکەم (بێ یارمەتی ئێوە). ئەوەیە کە من هەولم بۆ کەسێك دا کە لەولاتی خۆی دەرباز ببوو. بێ کەڵکە ئەگەر بڵێم من بۆ گەلێك هەولمدا نەك دژایەتیان، ئەویش لە بەر ئەوەی کە دەستووری تۆ بو دابووت. بێ کەڵکە ئەگەر بڵێم ماڵیاتم کۆ

کردۆتەوە، یان باج و کرێم وەرنەگرتووە یان ناقانونیم نەکردووە. ئێستە دەپرسم: ((لەبەر چی تاوانبار کرام؟)). تەنها وەلاَمێك کە دەتوانم بیدەمەوە ئەوەیە هەولّم بۆ ئاوارەیەك دابوو. ئێستا ئەو لە کوێیە؟

ئای لە مانسیۆر! ئێستا لە کوێیت؟ لە خەونیشدا هەر دەپرسم ئاخۆ لە کوێ بێت. ئەگەر بێ و لێرەدا من ئازاد بکات داوای بەهەشت دەکەم. بەلاّم وەلاّمی نییە. ئای مانسیۆر! من گریان پەژارەی خۆم دەنێرمە ئەو پەڕی دەریاکانەوە. بەو هیوایەی کە بگاتە لای تۆ لە بەنکی تیلسۆنەکاندا، کە لەپاریسدا ناودارە.

لە بەر خۆشەویستی بەهەشت داوات لێدەکەم. مانسیۆر، یارمەتیمبدە، لێرەدا ئازادم کە. گوناهی من ئەمەیە کە لەگەلّ تۆدا راست و دروست بووم. ئەگەر تۆش لەگەلّ مندا راست بیت سەرت بۆ نەوی دەکەم.

مانسیۆر! لەم بەندیخانەی سەربەرزییەوە، ئەو شوێنەی کە مەرگ بەرەو پیریم دێت و لێم نزیك دەبێتەوە، لەبریتی خزمەتە قوڕبەسەریەکانم هانای پارێزگاری کردنت بۆ دهێنم.

دۆستی بەدبەختی تۆ

گابل

دارنی زۆر مێشکی پەرێشان بوو بە خوێندنەوەی نامەکە. ئەو بە گابل وتبووی کە لەگەلّ خەلّکدا باش رەفتار بکات چاوپۆشی لەخەلّك بکات. ئەوەی کە ئیشی باشە لەگەلّ خەلّك بیکات. بیان بەخشێ بەوەی کە لە ژیانی بچووکیاندا پێیان بەخشراوە ئێستاش نۆکەرە شەڕاوییەکەی لە بەندیخانەدایە و تاوانەکەشی ئەمەیە کە ئەلّێ من ملکەچی دەستوور بووم، یانی ئەوەی کە پێم ئەمر کراوە بەجێم هێناوە.

بۆ دارنی ئەمەش رون بوو کە ئەبێ هەر بۆ پاریس بڕوات. هیچ مەترسییەکی تێدا نەدەبینی. ئەو بیری لەوە دەکردەوە کە خەلّکی فەڕەنسا رۆژێك یادی ئەو کارە دەکەنەوە کە کردوویەتی. ئەگەر چی ئەو کارەش ناتەواو مابێتەوە. کەواتە لەوانەیە ئەو بتوانێت ژیانی کۆنە نۆکەرەکەی خۆی رزگار بکات کە ئێستاش هەر چاوەڕوانی دەستی ئەوە.

لەکاتێکدا کە هەر دەهات و دەچوو، بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن بکات. بۆیە

بڕیاریدا نابێ لویس و باوکی هیچکامیان بزانن کە ئەو لە سەر ڕۆیشتنە تا ئەو کاتەی کە دەڕوات ئەمە چاکترین کار دەبێت کە نیازەکەی خۆی لای خۆی رابگرێت لە بەر ئەوەی کە ئەبێ تا ئەو رادەیەی بۆی ئەکرێ دڵگران بێت بەو جیابوونەوە.

بە هەموو ئەم راوێژانەوە لە مێشکی خۆیدا گەڕایەوە بۆ خواحافیزی لە مستر لۆری.

وتی: ((نامەکەم گەیاند وەڵامی نەدرایەوە. بەڵام لەوانەیە قسەی خۆتت وەرگرتبێت)).

مستر لۆری وتی: ((بە دڵنیاییەوە)).

((ئەو زیندانییە کە لە ((ئەبی))دا ناویشی گابیلە)).

((گابیل)).

((پەیامەکەش ئەمەیە. نامەکەی پێگەیشتووە و دێت بۆ ئێرەش)).

((کاتی بۆ دیاریکراوە؟)).

((سەفەرەکەی خۆی بەیانی زوو دەسپێدەکات)).

مستر لۆری وتی: ((زۆر باشە. ئێستاش ئەڕۆم. هەستی خۆشەویستی من بە لویس راگەیەنە. بۆ لویسیش هەروەها و ئاگات لێیان بێت تا دێمەوە)).

چارلز دارنی بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە گومانەوە سەری راوەشان لەکاتێکدا کە ئەو سوارگارێك بوو رۆیشت.

ئەو شەوە چواردەی مانگی ئوت بوو. دانیشت و دوو کاغەزی نووسی. بۆ ئەوەی پاش رۆشتنی خۆی بگەیەنێت. یەکێکیان بۆ لویس و ئەوەی دی بۆ دکتۆر. مەوزوعەکەی بۆ هەر دووکیان شیکردبوەوە ئەوەشی نوسیبوو کە لە فەرانساوە بۆیان دەنووسێ.

رۆژی دواتر بۆ ئەو رۆژێکی دژوار بوو. لە بەر ئەوەی کە لەگەڵیاندا دانووستانی دەکرد بێ ئەوەی پێیان بڵێت کە نیازی چی هەیە. سەر لە ئێوارە ژنەکەی و کچکەی ماچکرد و رۆیشتنە دەرەوە. ئاماژەشی کرد کە خێرا دەگەڕێتەوە. بەم بۆنەوە بە دڵێکی فراوانەوە رێی گرتە بەر بۆ سەفەر. بە شەوقی ئەوەوە کە بە فیکری خۆی دەڕوات بۆ یارمەتیدانی زیندانییە هەژارەکە لەو پەڕی دەریاکانەوە دەستە ئەژنۆ چاوەڕوانی ئەوە.

## - ١٦ -

# دارنی دەگەڕێتەوە بۆ فەڕەنسا

ساڵی ١٧٩٢ سەفەرێکی درێژ خایەن بوو بۆ ئەو لـە ئینگلتـەراوە بـۆپـاریس. ئەگـەر چـی هێشتا لویس پاشا بە سەر تەختەوە مابوو ڕێگە و بان لەپاریسدا خراپ بوو، گارییەکانیش هەر خراپ بوون و ئەسپەکانیش خوێڕی بـوون. بـەڵام لێـرەدا کێـشەی گـشتی هـەبوو. هـەر شـار و لادێیەك دەستە و تاقمی ((نیشتمانی))[٢] خۆی هەبوون هەموو بەچەکی پڕ کراوە دەست بـەچـەك بوون. هات و چوکەرانیان رادەگـرت، پرسـیاریان لێـدەکردن. بەڵگەنامـەکانیان و پێناسـەکانیان دەخوێندنەوە سەیری ناویان دەکردن.[٣] دەیانگەڕاندنەوە هەر وەهـا خـوار و ژووریـان پێـدەکردن. ئەگەر حەزیشیان کردبـا ئـەوا دەیـانگرتن کـە ئەمانـە هـەموو بـە نـاوی ((ئـازادی، بەرابـەری، برادەری))[٤] و وڵاتی کۆماری[٥] فەڕەنساوە بوو.

چارلز دارنی لە ڕێگەکەی ئاواییدا زۆر دوور نە کەوتبووەوە کـە بـیری کـردەوە قـەد ڕێگـەی گەڕانەوەی پێنادرێت بۆ پاریس تا ئەو کاتەی کە بەوەدا بنێت بەوەی کە هاووڵاتییەکی باشە لـە پاریسدا. ئەوەی کە لەوانەیە ڕێکەوێت ئەو تا کۆتایی لـە سـەفەرەکەی بـەردەوام بێـت. هـەموو دەرکێکی لیَ بەسترابوو ئەوەشـی دەزانـی کـە دەرگایـەکی دیکەشـی لـیَ دەبەسـترێت ئـەویش دەرگای خۆشەویستییەکەیەتی لە ئینگلتەرا ئەو وەك ئاژەڵێك کەوتبووە نێو داو وەك باڵندەیـەك کەوتبووە نێو قەفەسەوە، بە تەواوی ئازادی خۆیی لەدەستدا بوو.

---

٢- واتە نیشتمان پەروەر یان نیشتمان پەرەست.

٣- بە ناو لیستی تاوانبارەکاندا دەگەڕان بۆدۆزینەوەی تاوانکارەکان.

٤- بانگەوازێك بۆ کەشۆڕشگێڕەکانی کۆماری خوازی فەڕەنسا گرتبوویان بە دەسەتەوە کە دەڵێ: ((هەموو کەس ئازاد بێت، مافی وەك یەك هەبێت، ناکۆکی لە بەینیاندا نەبێت وەك برا بن)).

٥- کۆمار: شێوازێکی دەسەڵاتدارێتی لە وڵاتدا بیَ پاشا. ئەویش لە لایەن کەسێکەوە کە خەڵك هەڵیان بژاردبێت.

لە تاکە رۆژێکدا بیست جارا رادەگیرا، پرسیاری لێدەکرا، هات و چۆی پێدەکرا. سێ رۆژی تەواو بە رێوە بوو بە سەر رێگەی فەرەنسەدا دەڕویشت هەر نەی دەگەیشتێ لە قاوەخانەیەکی سەر رێگەدا لە بەر ماندوویەیی و هیلاکی پشوویەکی بۆدا و خەوت. هەر بە نیشانی دانی نامەکەی گابیلەوە بووە تا ئێرە توانیویەتی بێت. بۆیە بە لایەوە سەر سوڕ هێنەر نەبوو کە لە نیوەی شەودا لەلایەن دوو چەکداری نیشتمانی و مەسئولێکەوە خەبەر کرایەوە.

مەسئولەکە وتی: ((هۆی هەڵ هاتوو! ئەمەوێ بتنێرم بو پاریس لەگەڵ چەند سەربازێك بۆ ئەوەی ئاگایان لێت بێت. تا چاوت بەوەی کە چاوەڕوانتە بکەوێت)).

((هاوشاری! من لە گەیشتن بە پاریس ئارەزوویەکی دیکەم نییە! بەڵام پێویستیم بە سەرباز نییە)).

یەکێك لە چەکدارەکان بە قۆنداغی تفەنگەکەی دای لە قەنەفەی خەوتنەکەی وتی: ((بێ دەنگ بە. ئارام بە! ئەریستوکرات!)).[٦]

بەرپرسەکە پشتڕاستی کردوەوە: ((وایە وەك ئەو وەتەن پەرستە وتی تۆ ئەریستوکراتی. تۆئەبێ نگابانت ببێت، ئەبێ کرێی بۆ بدەیت. هەڵسە و خۆت گورج بکەرەوە، هەڵهاتوو!)).

دارنی کە هیچی لە دەست نەدەهات ملکەچ بوو، هەڵیانگرت و بردیان بۆ بارەگا ئەو شوێنەی کە ((وەتەن پەرستەکان)) پشوویان دەدا و جگەرەیەکیان بۆدەکێشا یان لەدەور و بەری زۆپاکە دا خواردنەوەیان دەخواردەوە. ئەبوا ئەو لەوێدا پارەیەکی زۆری بۆ نگابان کە ئیسکۆرتی بکات بدایە و سەعات سێی بەیانیش ئەبوا لە سەر ئەو جادە تەڕ و بڕەدا بهاتایەتە دەرەوە.

نگابانەکان بریتیبوون لەدوو ((وەتەن پەرست)) بە کلێتەی سوورەوە. هەر دووکیان چەکدار لەملاو لای ئەوەوە سوار بوون. یەکێکیان پەتێکی مەحکەم بەست بە ئەسپەکانی دارنی و ئەو سەرەکەشی ئاڵاند لە قۆڵ و بازووی خۆیەوە. بەم شێوە لێیان خوڕی. هەندێ ترس و لەرز دارنی داگرت بەڵام دڵنیا بوو کە ئەمانە هەموو بە باش دەرئەچێ کاتێك کە گابیلە پێیان بڵێت بۆچی

---

٦- ئەریستۆ کرات: ناوێك بۆ بانگکردنی ئەشراف زادەکان کە لە وڵاتدا دەسەڵاتێکیان هەبێت شۆڕشگێڕەکان ئەم وشەیانە وەك ناوێکی پیس و خرابکار بۆ ئەو ئەشراف زادانە دادەنا کە لەفەرەنسەدا ئازاریان بە گەل دەگەیاند.

گەڕاوەتەوە.

لە ناو شاری ((بیۆڤیس))دا خۆی لە ناو خەتەرێکی گەورەدا بینییەوە. کۆمەڵێك خەڵكی تووڕە دەورو پشتیان لێگرت و قیڕەیان دەکرد بەسەریدا، ((بمرێ هەڵهاتوو!)) ئەو دەیویست تێیان بگەیەنێت و لەگەڵیان بدوێت.

((هەڵهاتوو، هاوڕێیان! من لە بەر هەلویستی ئازادیخوازی خۆم لێرەم)).

پیاوێك کە پێکێکی بەدەستەوە بوو لێی نزیك بووەوە قیڕاندی بە سەریا: ((تۆ هەڵهاتوویەکی بۆگەنی. تۆ ئەریستۆکراتێکی بۆگەنی)).

مەسئوولێك خۆی خستە بەینی داڕنی و پیاوەکە: ((وازی لێبێنن، وازی لێبێنن. ئەو ئەبێ لە پاریس دادگایی بکرێت)).

یەکێکیتر هاواریکرد: ((ئەرێ! ئەبێ دادگایی بکرێت. بەڵێ ئەبێ وەك خائینێك بە خەیانەت و تاوان دادگایی بکرێت)).

داڕنی وتی: ((هاوڕێ من خائین نیم)).

پیاوەکە قیڕاندی: ((درۆ ئەکات بە گوێرەی یاسای نوێ خۆی و ماڵ و موڵكی هینی حکوومەتە)).

بەڵام داڕنی تا ئەو کاتەی نگابانەکان هاوڕێیەتی ئەویان کرد تا نێو حەوشەی میوانخانەکە و دەرگاکەیان لە خەڵکە تووڕەکە داخست، خۆی بەبێوەی نەدەزانی.

پرسیاری کرد: ((ئەوە یاسای نوێ چییە؟)).

((یاسایەکە کە ئەو کەسانەی لە وڵات هەڵدێن و دەگەڕێنەوە بە مەرگ تاوانبار دەکرێن. کە ئەم یاسایە لە ڕۆژی چواردەی ئەم مانگەدا داسەپێنراوە)).

((ئەو ڕۆژەی کە من ئینگلتەرام بە جێ هێشت)).

پاش پشوودانێکی کورت، و چەند سەعاتێك سەفەری پڕ مەترسی، لەکۆتاییدا یەکتریان لە پاڵ نەردەی دیوارەکانی دەرەوەی پاریسدا دیتەوە. نەردەکە بەتوندی نگابانی دەدراو بەسترابوو، ئەو کاتەی کە ئەوان بە سواری بە سەریدا ڕۆشتن ڕاگیران.

پیاوێکی بە ڕواڵەت دیاریکراو لە مقەڕەکە هاتە دەرەوە، وا دیار بوو کەپیاوێکی دەسەڵاتدارە.

داوای کرد: ((بەڵگەنامەکانی زیندانییەکە لەکوێیە؟)).

دارنی بە تورەیی وتی: ((زیندانی! مـن مرۆڤێکـیٚ سـەربەخۆ و ئـازادم.مـن هاوولاتییـەکی فەرەنـسیم. مـن لـە بـەر ویـستی ئـازادیخوازی خـۆم گەڕاومەتـەوە بـۆ فەرەنـسا. لەگـەڵ ئـەم نگابانانەشدا سەفەر دەکەم بۆیە حەقی خۆیانم پێداون)).

پیاوەکە هیچ ئاوڕێکی لێنەدایەوە.

دوپاتی کردەوە: ((بەڵگەنامەکانی زیندانییەکە لە کوێیە؟)).

یەکێك لە وەتەن پەرستەکان بەڵگەنامەکانی هێنا و دایە دەستی. پیاوەکـە چاوی خـشاند بەنێو بەڵگەنامەکاندا و نامەکەی خوێندەوە. پاشان بیٚ ئەوەی یەك وشە بـدرکێنیٚ گەڕایـەوە بـۆ نێو مقەڕەکە. لـەم کاتـەدا بـە سـواری لـە دەرەوەی نەردەکانـدا راوەسـتابوون. دارنـی چـاوێکی بەدەوری خۆیدا گێڕا ئەو کاتەی کە چاوەڕوان بوون کۆمەڵێکی مەزنی خەڵکی کـە بـریتی بـوون لە ژن و پیاو بە سواری ولاخ و گاری، هەموو چاوەڕوان بوون بێنە دەرەوە. بەلاٌم هـەموو زۆر بـە توندی تاقیدەکرانەوە. بۆیە هەموویان ئەبوا بە زۆر ماوەیەکی درێژ چـاوەڕوان بوونایـە. بۆیـە لـە سەر زەویدا راکشابوون بۆ ئـەوەی خـەونیان لێبکـەوێت. هەنـدێکیتریـان پێکـەوە دەدوان. یـان بێدەنگ چاوەڕوان بوون. گشت کەسێك چ ژن چ پیاو کلێتەی سووری لە سەر نابوو.

پاش ماوەیەکی زۆر درێژ پیاوێك هاتە دەرەوە دەستووریدا بە نگابانەکان نەردەکـە بکەنـەوە پاشان رەسیدێکیدا بە ئیسکۆرتەکان بۆ زیندانییەکەیان و دەستووریدا لە ئەسـپەکەی دابـەزێت. ئەمرەکەی بە جیٚ هێنا بۆیە ((وەتەن پەرستەکان)) ئەسپەکەیان کە هیلاك بوو راکێـشا و بردیـان گەڕاندیانەوە بیٚ ئەوەی بیەڵن بچێتە نێو شارەوە.

دارنی برایە ناو مقەڕەکـەوە. چـەند کەسـێك لـە سـەربازەکان و ((وەتـەن پەرسـتەکان)) کـە جگەرە و عارەقیان خواردبووەوە، بە دەنگـی بـەرز پێدەکـەنین هەنـدێکیان بـە پێـوە وەسـتابوون ئەوانیش راکشا بوون. هەندیٚ کتـێبی ئەسـتوور بـە کراوەیـی بـە سـەر مێزەکـەوە فرێـداربوون. ئەفسەرێکی بیٚ ئەدەب کە لە تاریکیدا تارماییەکەی دیار بوو کە سەیری دەکردن.

ئەو ئەفسەرەی کە دارنی هێنابووە ژوورەوە بۆ لای پیاوەکەیتـر وتـی: ((هاوشـاری دیفـارج، هاوشاری دیفارج. ئەمەتە ئیڤرمۆندی هەڵهاتوو؟)).

دیفارج وەلاٌمی دایەوە: ((خۆیەتی)).

((تەمەنت چەندە، ئیڤرمۆند؟)).

((سی و حەوت ساڵ)).

((ژنت هێناوە، ئیڤرمۆند؟)).

((بەڵێ)).

((ژنەکەت ها لە کوێ؟)).

((ئینگلتەرا)).

((بێ گومان! تۆ ئەبێ ببرێیت بۆ زیندانی ((لا-فۆرس))[٧] ، ئیڤرمۆند)).

دارنی بەتوورەییەوە هاواری کرد: ((بە خوا سەیرە! لەپێناوی کام تاواندا؟ بە کام یاسا؟)).

((ئیڤرمۆند، ئێمە یاسایەکی نوێمان هەیە. لەو کاتەوە کەتۆ ئێرەت بە جێ هێشتووە)).

ئەوانەی وت و دەستیکرد بە نووسین.

((داوات لێدەکەم گەشبین بە لەوەی کە من بە حەز و ئاواتەوە هاتوومەتەوە. بۆ وەڵامی ئەو نامەیشە کە لە بەردەستا حازرە.نامەکە هینی هاوولاتییەکی تێکۆشەر و شۆڕشگێڕە، من هیچ مافم نییە؟)).

وەڵامی ئەمە بوو: ((ئیڤرمۆند، هەڵهاتووەکان هیچ مافێکیان نییە)).

ئەفسەرەکە ئەوەی کە نووسیبووی بۆ خۆی خوێندییەوە و دایە دەستی دیفارج و ئەم وشەیەشی درکاند: ((بەنهێنی)).

دیفارج داوای لە زیندانییەکە کرد لەگەڵیدا بڕوات. نگابانێکی وەتەن پەرست هاتە لایان و لەگەڵیان ڕۆیشت.

لەکاتێکدا کە لە پلەکانی مقەڕەکە دەچونە خوارەوە کە بگەڕێنەوە بەرەو پاریس دیفارج وتی: ((ئەمە تۆیت؟ تۆیت کچەکەی دکتۆر مانێتت مارەکردووە؟)).

دارنیش بە سەر سوڕمانێکەوە سەیری کرد: ((بەڵێ)).

---

٧- LA-FORCE: زیندانێکی گەورە بوو لە فەڕەنسا کە لەژێر چاوەدێری توندی هێزی لەشکری دەوڵەتی فەڕەنسادا بوو. دوایی کەوتە دەستی شۆڕشگێڕەکان و ئەوانیش هەروەك زیندان بەکاریان هێنا بۆ تاوانباران.

((من ناوم دیفارجه،من دوکانی شەرابفرۆشیم هەیە لە شـەقامی ئانتۆینـە.. لەوانەیـە نـاوی منت بیستبێت؟)).
((بەڵێ، ژنەکەم لەوکاتەدا بە دوای باوکیدا دەگەڕا هاتۆتە ماڵی ئێوە)).
((باشە تۆ بۆچی هاتوویتەوە بۆ فەرەنسا؟)).
((تۆ هۆی گەڕانەوەی منـت چـەند چرکەیەك لەمـەوپێش بیـست. بـڕوا ناکـەی کـە راسـت دەکەم؟)).
دیفارج وتی: ((بە سەرهاتێکی خراپە)).
((لەراسـتیدا، هەسـتدەکەم بـە سـەر چـووبێت. هـەموو شـتێك لام چـاوەڕوان نـەکراو بـوو. هەمووی گۆڕانکاری بە سەر هات. هەمووی ناڕەوا بوو. وا دەزانم کاتی بە سەر چـوون بێـت تـۆ هیچ کارێکم بۆ دەکەی؟)).
((هیچ)).
((لەو بەندیخانەیەی کە ئێستا منی بـۆ دەبـەیت. نـاتوانم هـیچ پـەیامێك لـە دنیـای دەرەوە وەربگرم؟ ئایا بێ ئەوەی بتوانم لە خۆم دیفاع بکەم دادگایی دەکرێم؟)).
((خۆت دەیبینیت. بـەڵام خـۆتی بـۆ دابنـێ پـێش ئێـستا کـە سـاڵێ تـر رەوانـەی شـوێنی نائومێدی کراون)).
((ئەمە بۆ من تایبەتمەندییـەکی مەزنـە کـە بتـوانم پـەیامێك بـۆ مـستر لـۆری لـە بـانکی تیلسۆنەکان بنێرم کە ئێستا لەپاریس دایە. تۆ ئەتوانی ئەو پیاوەتیم لەگەڵدا بکەیت؟ بەس بڵـێ بە مستر لۆری کە من هاوێژراومەتە نێو زیندانی لافۆرس)).
((من ناتوانم هیچت بۆ بکەم. ئەرکەکانی من بۆ وڵاتەکەم و بـۆ گەلەکەمـە، مـن دوژمـنی تۆم هیچ پیاوەتییەکت لەگەڵ ناکەم)).
داڕنـی هەسـتیکرد کـە دووبـارە داوای لێبکاتـەوە بێکەڵکـە. بێـدەنگ هـەنگاویان دەنـا. رۆیشتنیان بە نێو شەقامەکەدا سەرنجراکێش نەبوو. کەسێکی خۆ پۆش بـۆ زینـدان دەچـوو وەك کرێکارێك کە ئەچێ بۆ سەر کار، لە بـەر چـاوی خەڵکـدا بـوو، بـەس منـداڵان بـوون بـە وردی سەیریدەکردن، چەند نەفەرێکیش لایەکیان لێکردنەوە و چەند کەسـێکیش وەك ئەریـستوکراتێك تانە و تەشەریان لێدەدان، بەڵام لە لایەکیترەوە هیچ ئاوڕێکیان لێنەدانەوە. لە سووچـێکی تـری

شەقامەکەوە کابرایەك برێ خەڵکی کۆ کردبووەوە کە دارِنیش لە کاتی تێپەربونیدا هەندێ شتی گوێ لێبوو. تێگەیشت کە پاشا خراوەتە نێو زیندانەوە و باڵوێزخانەکانیش گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتی خۆیان.

بەندیخانەی ((لافورس)) شوێنێکی تاریك و نوتەك و ناخۆش بوو. بۆنی تاوان و گوناحی لێدەهات. دیفارج زیندانییەکەی تەسلیمی زیندانەوانەکە کرد بەم چەند وشەوە: ((هەڵهاتووە ئیڤرمۆند)).

زیندانەوان (فەرماندە) وتی: ((لەم شەیتانە! چەند کەسی وان؟)).

رەسیدێکی دا بە دیفارج لە بریتی زیندانییەکەی.

بە ژنەکەی وت: ((ئەڵێم چ شەیتانێکە، چەند زۆرن؟)).

ژنەکەی وەڵامی دایەوە: ((خۆشەویستم، لە بەر ئازادی ئەبێ ئێمە خۆڕاگر بین)).

درێژەی پێدا: ((هەروەها لە بەر نهێنی. بۆیە هەموو شوێنێك پڕ کراوە)).

((فەرماندە)) زەنگێکی لێدا و سێ پیاو هاتنە ژوورەوە، هەموویان سەیری دارِنییان کرد. وا بە قووڵی سەیریان کرد کە بۆ ماوەیەکی درێژیش هێمای لە بەر چاویان دابمێنێت پیاوێکیان کلیلکەی هەڵگرت وتی: ((وەرە! وەرە لەگەڵ من هەڵهاتوو)).

سەرەوخوار کونا و کون و سەرەوژوور بە پلە بەردینەکاندا لێیاندا رۆیشتن. بە ناو ئەو دەروازانەی کە تاقانە بوونەوە بۆ ئەوەی رێگەیان بدرێت بڕۆن و لە دوای ئەوان دادەخران. تا دەگەیشتنە بەشێکی بەرین، کە بەچەند هۆدەیەکی بچووك دابەش بووبوو کە هەر کام پڕ بوون لە زیندانی، هەم ژن و هەم پیاو. ژنەکان بەدەوری مێزێکی مەزندا خڕ ببوونەوە کە خەریکی چنین و دوورین بوون و پیاوەکانیش بە پێوە راوەستابوون لە نێو هۆدەکەدا هەر خوار و ژووریاندەکرد. لێرەدا پڕ بوو لە کەسایەتی ئەو بنەماڵە ئەشرافیانەی فەڕەنسا. هێشتا لەم شوێنی نەهاتی و بەدبەختییەدا، ئەوان هەر شێوازی هەڵس و کەوتی خۆیان وەك ئەو کاتەی کە لە قەڵاکەدا بەڕێوەیان دەبرد لەزیندانیشدا هەر کەڵکیان لێوەردەگرت.

جوامێرێك بەشێوازی خوو و رەوشتی ئەشرافزادەیەك هاتە پێشەوە دانەوی وتی: ((من سەربەرزم بە بەخێر هاتنت بۆ لافۆرس و هاودەردی خۆشم دەردەبڕم سەبارەت بە تێکەڵبوونت لە ناو ئێمەدا. لەوانەیە مانەوەشت لێرەدا زۆر نەخایەنێت بەخۆشییەوە! ئەکرێ تکات لێبکەم

ناوی خۆتمان پێ بڵێیت؟)).

دارِنیش زانیارییەکانی خۆی وت.

لە دوای چاوتروکانێك بە زیندانەوانەکە جوامێرەکە وتی: ((بەڵام هیوادارم تۆش نهێنی نەبێت)).

((بە راستی من مانای ئەو وشەیە نازانم. بەڵام زۆری دەبیسم)).

((ئاە، چ حەیفە (خەسارێکە). لە قووڵایی دڵەوە بە خەساری دەزانین. بەڵام لە خۆ بردوو بە چەند ئەندامێکی ئەنجومەنەکەی ئێمە ناوی نهێنییان بوو، بەڵام ماوەیەکی کورتی نەخایاند)).

پاشان دەنگی بەرزکردەوە. درێژەی پێدا: ((بە حەیفی دەزانم ئەو بەشدارییە نهێنییە بناسێنم)).

کە دارِنی بە ناو هۆدەکەدا تێپەڕی دەکرد بۆ ئەو شوێنەی کە ئەفسەرەکە چاوەڕوانی ئەو بوو دەنگی پرتە و بۆڵەی هاودەردی دەهاتە گوێی. بە ناو دەرگایەکدا تێپەڕی کرد کە ئەو لێی داخست و بە سەر هەندێ پلیکانەی بەردینەدا سەرکەوت کە لە بەردەمیدا بوو. دەرگایەکی بچکۆلەی رەشی تەقاندەوە و بەناویدا تێپەڕیان کرد بۆ ناو هۆدەیەکی بچکۆلەی بەتاڵ. تەڕو بڕ و سارد بوو بەڵام تاریك نەبوو.

پیاوەکە وتی: ((هینی خۆتە)).

((من لە بەر چی ئەبێ بە تەنیا زیندان بم)).

((من چۆن بزانم؟)).

((دەتوانم قەڵەم و دەفتەر و جەوهەر بکڕم؟)).

((ئەمانە لە ئەستۆی ئەمری مندا نییە، دێن بۆ چاوپێکەوتنت، ئەو کاتە دەتوانی داوا بکەیت. لە حاڵی حازردا دەتوانی خواردەمەنییەکەت بکڕی و هیچی دیکە)).

لە ژێرزەمینەکەدا کورسییەك، مێزێك و قەنەفە و پێخەفێك دانراوە و زیندانەوانەکە پێشتر سەردانی کردووە.

دارِنی گوێی لێبوو کلیلەکەی خڕەی داخستنی دەرگاکەی دەهات. ئەو تەنها مایەوە لە زیندانی ((لافورس))دا.

## - ١٧ -

# مستر لۆری لە (پاریس)دا

کاتێك کە مستر لۆری گەیشتە پاریس، لە ناو شاردا هۆدەکانی بانکی تیلسۆنەکانی خستە ژێر کۆنترۆڵ بەو مەبەستە بوو کە بتوانێ بە بڕوایەکی باوەڕ پێکراو کار و کاسبیەکەی خۆی دیبێتەوە. شەوێ لە شەوان لە پاڵ زۆپاکەدا بۆخۆی دانیشتبوو. لەپڕ دەرگای هۆدەکەی تەقێنرایەوە. دوو زەلامی زەبەلاح خۆیان هاوێشتە ژوورەوە. پەیدا بوونیان ئەوەندە چاوەڕوان نەکراو بوو کە ئەو سەرتاپا بە لایەوە سەر سوڕهێنەر و پڕمەترسی بوو.

((لویس! مانێت! چ باسە؟ چی روویداوە؟)).

لویس هاواری کرد: ((ئۆف، هاوسەری خۆشەویستم! هاوسەرەکەم!)).

((لویس هاوسەرەکەت؟)).

((ئەو لێرەدایە لە پاریسا! ئەو سێ چوار رۆژە لێرەدایە. هاتووە بۆ یارمەتیدانی کەسێك. خراوەتە نێو زیندانەوە)).

ئەو پیاوە پیرە دەستیکردە گریان.لەم کاتەدا زەنگی دەرگا گەورەکەی حەوشەکە لێدرا. دەنگی پێ و دەنگی چەند کەسێك هات لە نێو حەوشەکەدا.

دکتۆر گەڕا بە لای پەنجەرەکەدا وتی: ((ئەو هەرا چییە؟)).

مستر لۆری قیڕاندی: ((مەڕوانە بۆ دەرەوە. لە بەر ژیانی خۆت، مەیەڵە بت بینن!)).

دکتۆر مانێت وتی: ((دۆستی خۆشەویست من لەباستیلدا زیندان بووم. لێرە ساغم هیچ کەس زیندانەکەی منی نەدەزانی کەس نەیتوانی هیچم بۆ بکات زەحمەت و رەنج کێشانم ئێستا هێز و توانایی پێداوم. ئەوان ئێمەیان هێنایە نێو شارەوە بە هەواڵی چارلز بە خەبەرین. من دەزانم هەر وا دەبێت. دەتوانم چارلز ئازاد بکەم. ئەو هەرایە چییە؟)).

مستر لۆری دووپاتیکردەوە: ((مەڕوانە! تۆش نە. لویس خۆشەویستەکەم.چارلز لەکوێیە؟)).

((ها لە زیندانی لافۆرسدا)).

((لا-فورس! لویس تۆ ئەبێ ئەوەی کە پێت رادەگەیەنم ئەنجامی بدەیت. تۆ ئەم شەو توانای هیچ کارێکت نییە. تۆ دەبێت بێدەنگ لێرەدا بمێنیتەوە لە هۆدەکەی پشتەوەدا و مـن و باوکـت بە ماوەی چەند چرکەیەك بە جێ بێڵی)).

((تێدەگەم ئێوە چی دەڵێن. من دەتوانم بەکەیفی ئێوە بکەم)).

پیرەمێردەکە گرتی ماچیکرد. لە دواییدا بەپەلە کردی بە هۆدەکەدا و دەرگاکـەی لـە سـەر داخست. پاشان خێرا گەڕایەوە بۆ لای دکتۆر و پێکەوە هەر دووکیان لەنێو پەنجەرەکەوە سـەیری دەرەوەیان کرد بۆ ناو حەوشەکە. چل پەنجا نەفەر لە نێو حەوشەکەدا خەریکی تیـژکردنی چـەقۆ، شمشێر و هەر چەکێکی‌تر بوون. سەر و چاویان لە ژن و پیاو توڕە و رقاویی و ترس هێنەر بـوون. گریان لیٚ‌هەڵدەستا لەتوڕەییدا. تەنانەت سەر و چاوی خۆیان خوێناوی کردبوو.

مستر لۆری وتی بە چپەوە:))خەریکن زیندانییـەکان دەکـوژن، ئەگـەر متمانـەت بـەقسەی خۆت هەیە کە دایان دەمرکێنیتەوە خۆتیان پێ بناسێنە. پێیان بڵێ کە تۆ کێیـت و لەگەڵیانـدا بچۆ بۆ لا-فۆرس لەوانەیە دێریش بێت. با دیرتری پێ نەچێت)).

دکتۆر مانێت دەستەکانی مستر لۆری گوشی و بە پەلە رۆیشتە دەرەوە. کـە ئـەو گەیـشتە ناو حەوشەکە مستر لۆری گەڕایەوە بۆ بەر پەنجەرەکـە. پرچـی سـپی دکتـۆر، هێمـای بێوێنـە و هەڵس و کەوتی باوەڕپێکراوی بوونە هاندەری بۆ تیکـەڵبوون لەگـەڵ خەڵکەکـەدا. بـۆچـرکەیەك بێدەنگ بوون. پاشان مستر لۆری ئەوی لە ناو خەڵکەکەدا دیتەوە کە لـە دەوری کـۆ بوونـەوە و هاواریـان دەکـرد ((بـژی زیندانییەکـەی باسـتیل! یارمـەتی هاوڕێکـەی بـدەن لـە لا-فۆرسـدا! ئیڤرمۆندی زیندان کراو لە لا-فۆرسدا ئازاد بکەن!)).

مستر لۆری پەنجەرەکەی جێ هێشت و بە پرتاو خۆی گەیانـدە لـویس، ئـەوەش کـە روویـدا بۆی گێڕایەوە. لەنێو هۆڵی هاتنە ژورەوەدا خـاتوو پـرووس و منداڵەکـەی دیـت. بـەو شـەوگارە درێژە تا بەیانی چاوەڕوانی هەواڵبوون بەلاّم کەس نەهات. تا نیوەرۆی رۆژی دواتر. هێـشتا هـەر هەواڵیان لە هیچ نەبوو، تەنانەت وایلیّهات مستر لۆری دڵ گران بوو. ئـەبێ لویـسیش چـیتر لـە بنکەکەدا زیاتر نەمێنێتەوە. لە بەر ئـەوەش کـە لـە سـەر شـانی ئەرکـە ئـەبێ هـیچ تـەنگ و چەڵەمەیەك لە نێو بانکەکەدا دروستنەکات. ئەگـەر بـۆ پاراسـتنی گیـانی هاوڕێکەشـی بێـت. کاتێك کە کێشەکەی لای لویس کردەوە. لویس وتی باوکم نیازی وابوو چەند هۆدەیەك لە نزیـك

ئەم بانکەدا بە کرێ بگرێت.

سەرەتا دەستی لویس و منداڵەکەی و خاتوو پرووسی گرت و بۆ نێو ماڵە دەربەسەکە رایمالێن. ئەو پێداویستیانەی کەتا ئەو کاتەی بۆ خۆشی نەویستبووی بۆ ئەوانی دابینکرد لە بەر ئەوەی کە ئاسوودە بژین. جێری لەوێ جێ هێشت لە بەر ئەوەی چاوەدیری لەوان بکات و ئاگای لێیان بێت. پاشان گەڕایەوە بۆ نێو بانکەکە تا ئەو کاتەی کە ماوەی ئیشکردن کۆتایی پێهات و بانك داخرا لەوێ کاریکرد. لەکاتێکدا کە ئەو زۆربەی جار لە هۆدەکەی خۆیدا بە تەنها بوو، تەقەی پێیەکی بیست کە لە پلیکانەکان دەهاتە سەرەوە. پاش ماوەیەکی کورت پیاوێك هاتە سەرەوە بۆ لای ئەو ناونیشانی خۆی هەڵدا خۆی بە ناوی خۆیەوە ناساند.

مستر لۆری وتی: ((نۆکەرەکەی تۆ، ئەی تۆ من دەناسی؟)).

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: ((ئەی تۆ من دەناسی؟)).

((تۆم لە فرە شوێن دیتووە)).

((لەوانەیە لە دوکانی شەرابفرۆشەکەمدا؟)).

((تۆ لە لایەن مانێتەوە دییت؟)).

((بەڵێ)).

دیفارج لەتێ کاغەزی دا بە دەستیەوە کە بە دەستی دکتۆر چەند وشەیەکی لێ نوسرابوو:

((چارلز بێوەیە. بەڵام خۆم نەمتوانی ئێرە جێبێڵم. هەڵگری نامە و ناو نیشانێکی کورتی لە سەر چارلز پێیە کە بۆ ژنەکەیەتی. رێگەی بدە با ژنەکەی چارلز ببینێت)).

مستر لۆری بە خۆشحاڵییەوە وتی: ((لەگەڵم دێیت بۆ ئەو شوێنەی کە ژنەکەی ئەوی لێ دەژی؟)).

دیفارج وتی: ((بەڵێ)).

کە دیفارج زۆر بە هێۆاش قسەی دەکرد، مستر لۆری بە سەختی لێی تێدەگەیشت.

رۆیشتنە خوارەوە بۆ ناو حەوشەکە دوو ئافەرەتیان دیت کە یەکێکیان خەریکیدوورین بوو.

مستر لۆری وتی: ((مادام دیفارج دڵنیام! لەگەڵمان دێت؟)).

((بەڵێ. کەواتە لەوانەیە ئەو بتوانێت زیندانییەکە بناسێت.ئەمەش بۆ بێ وەیی ئەوان باشترە)).

مستر لۆری بە گومانەوە سەیری دیفارجی کرد و ڕێگەکەی نیشاندا. هەر دوو ئافرتەکە بە دوایاندا چوون. ژنەکەی تر و ڤینگێنس بانگدەکرا.

جێری ڕێ پێدان بێنە ژوورەوە لەوێدا لویسیان دیت بەتەنیا، زۆر کەیف خۆش بوو بە بیستنی ئەو هەواڵە لەعەزرەتا هەر دەستەکانی دەگوشی.

«ئەی خۆشەویستم ورەت بەرز بێت من باشم و باوکیشت دەسەڵاتی لێرەدا زۆرە. تۆ ناتوانیت وەڵامم بۆ بگێڕیتەوە. لە منەوە مناڵەکەمان ماچکە».

ئەمە هەموو ناوەڕۆکی نامەکە بوو، بۆ ئەوەی کە ئەو دەستی کەوت وەك هەواڵیش هەر زۆر بوو. دەستەکانی مادام دیفارجی ماچکرد. بەڵام ئەو حەزی پێنەدەکرد هەر دەستیکردەوە بە دوورین. لە بەر ئەوەی کە لەو نزیك بوونەوەدا شتی لێ دەردەکەوت لویس تۆزێ بۆی وەستا و سەیری مادامی بە ترسەوە دەکرد.

مستر لۆری دەدوا: «خۆشەویستم لە نێو شەقامەکاندا پێکدادان هەر بەردەوامە. مادام دیفارج ویستی چاوی بە تۆ بکەوێت بۆیە ئەو ناسینە بۆ داهاتووش هەر باشە چونکە لەوانەیە پێویست بێت. ڕاستە هاوڕێ دیفارج؟».

هەرسێکیان لە بێدەنگییەکی بەردینەدا ئەم چەند وشەیان بیست.

«باشتر وایە بڵێین بە خاتوو پرووس ئەو مناڵە بهێنێت بۆ ئێرە». مستر لۆری درێژەی دا: «کەواتە ئەبێ ئەو بیانبینێت».

کاتێك کە خاتوو پرووس لویسی چکۆلەی هێنا، مادام دیفارج پرسیاری کرد:

«ئەمەیە کچەکەی؟».

مستر لۆری وتی: «بەڵێ، مادام».

مادام دیفارج وتی: «بەسە هاوسەر ئێمەئەبێ بڕۆین».

لویس وتی: «تۆ بۆ هاوسەرەکەی من باشتر دەبیت؟ ئەگەر بۆت کرا ڕێگەم پێدەدەی کە ئەو ببینم؟».

مادام وەڵامی دایەوە: «مێردەکەی تۆ لە بازنگەی کاروباری مندا نییە».

«وەك ژن و دایکی مناڵەکەی، داوات لێدەکەم بێیت بە دادمەوە. ئەوەی کە بۆت دەکرێ دەربارەی مێردە بەدبەختەکەی من هەوڵمان بۆ بدە».

((ئـەی ئـەو هـەموو هاوسـەر و دایکانـەی کـە ئێمـە لەوەتـەی منـاڵبوین دیومانـە چـی؟ هەموومان دایك و مێردەکەیانمان دیتـووە کـە بـەگـوێرەی پێویـست خراونەتـە نێـو زیندانـەوە سەرتاپای ژیانماندا دەیانبینین لە ئەشکەنجە و ئازار و برسیەتی، نەخۆشی و بەدبەختیدا ژیاون)).

ڤینگێنس وتی: ((ئێمە شتیترمان نەدیتوە)).

مادام دیفارج وتی: ((ماوەیەکی زۆر. ئەمانەمان بە دنیا هێناوە. تۆ بڵێی کێـشەی دایـك و هاوسەرێك لەم کاتەدا گرینگییەکی ئەوتۆی هەبێت)).

دەستیکردەوە بە دوورین و ڕۆیشتنە دەرەوە، ئەوانیش بە دوایدا.

مستر لۆری وتی: ((خۆشەویستم خیرەت بنوێنە. ئێمە لە خەڵکانیتر باشترین. شوکری خـوا بکە)).

لویس وتی: ((خۆ من هیچ ناسوپاسییەکم نەکردووە. هـەر ئومێـدەوارم. بـەڵام ئـەو ئافرەتـە ترسێنەرە وا دیارە ئەیەوێ بمخاتە ژێر سێبەرێکی ترسنۆکەوە و هەموو ئومێدەکانم داپۆشێ)).

ئەگەر چی مستر لۆری هەوڵی زۆری دا بۆ ئـەوەی دڵخۆشـی کـات هـەر وەهـا لـە ناخـەوە کێشەیەکی مەزنی لە مێشکیدا وەك نهێنییەك هێشتبووە.

چوار ڕۆژ رابورد بە سەر ئـەو ڕۆژەی کـە دکتـۆر مانێـت ڕۆیـشتبوو بـۆ لا-فـۆرس. پاشـان دکتۆر گەڕایەوە. ئەو دەربارەی ئەو چەند ڕۆژەی کە ئەو لەوێ بوو کە زیاتر لە یازدە نەفـەر ژن و پیاوی زینـدانی بـێ دیفـاع لـە هـەموو تەمەنەکانـدا بەدەسـتی خـەڵك کـوژران هـیچ شـتێکی نەدرکاند. ئەو (واتە لویس) هەر ئەوەندەی دەزانی کە هەندێ لە زیندانییەکان شۆڕشیان کردبـوو چەند زیندانییەك کوژران لە هێرشەکەدا. ئەو وتی بە مستر لۆری و شتێکی نهـێنی لـەوەی کـە ڕۆیداوە لای خۆی بێت.

دکتۆر مانێت شوێنێکی وەك دادگای نیـشتەجێ لەزیندانەکـەدا دۆزییـەوە وەك زینـدانێکی بەندیخانەی باستیل خۆی ناساند. دیفارج ئەوەی ناسییەوە پاشـان دکتـۆر داوای هەڵـسەنگاندنی داڕنی کرد بە خێرایی. دادگاکەش بـەڵێنی پێـدا، بـە هەنـدێ هـۆ (کـە دکتـۆر تێنەدەگەیـشت هۆکان چییە) لە ئـازاد بـوونی داڕنـی بـەرگریان کـرد. بـەڵام بەڵێنیانـدا بـەوەی کـە لەزیندانـدا سەلامەت بێت و هیچ خەتەرێك ڕووبەڕووی نەبێتو نەیکوژن. دکتۆر لە بەر چاوەدێری ئەو لـەوێ مایەوە هەتاکو رق و تووڕەیی خەڵکەکە دائەمرکێ.

کاتێك که دکتۆر هێمای ترسهێنەری نێو زیندانەکان هێنایە گۆڕێ مستر لـۆری مەتەرسـی ئەوەی دەکرد کە لەوانەیە ئەو ئەزموونە بێتە هۆی گەڕانەوەی نەخۆشییەکەی بەڵام کە ئـەو ڕوژە تێپەڕیکرد دەرکەوت کە ئەو یاد کردنەوە بووە ورە و وزە بۆ ئەو نەخوشییە. دکتۆر وتی:»کـاتی من لەزینداندا بە فیڕۆ نەچووە و تێنەشکاوە. کاتێك کە ڕۆڵـە خۆشەویـستەکەم هـات بـەهـانی منەوە کەچاك ببمەوە ئێستا لە سەرمە مێردەکەی بگەڕێنمەوە بۆ باوەشی. بەیارەی کەسـایەتی پاك، من دەستی دەدەمێ!«. کاتێك کە جارویس نیگای هێمن و ڕواڵـەتی بڕیـاری ئـەوی دیـت دڵنیا بوو کە دکتۆر بەرەو شار دەڕوات.

دکتۆر بە شێوەیەکی عاقڵانە لە هەستی خزمەتگوزاری خـۆی کـەڵکی وەرگـرت بۆیـە بـەم زوانە دەبێتە پشکێنەری زیندانەکان کە یەکێك لەو سێ زیندانە زیندانی لا-فۆرسە. بەم بۆنـەوە ئەو ئەیتوانی هەموو هەفتەیەك چاوی بە داڕنی بکەوێت و هەواڵەکەی بێنێتەوە بۆ لـویس. ئـەو هەر هەوڵێدەدا کە ئازادیبکات. یان تەنانەت بیهێنێتە دادگا. بەڵام ڕووداوەکان ئەو هەلەیان بـۆ نەدەڕەخساند بۆیە بە لایەوە زۆر قورس بوو. قۆناغێکی نوێتر دەسـتیپێکرد: پاشـا تاوانبـار بـە مەرگ کرا ئاڵای ڕەش بە سەر ترۆپکـی منارەکـانی نـۆتر — دام (کلێـسەی سـەرەکی پـاریس) دەشەکایەوە زیندانەکان پڕ بوون لە زیندانی ئەوانەش کە هیچ تاوانکارییـەکیان ئەنجامنـەدابوو و گالیوتین[٨] هێنرابووە سەر پـێ ئـەوەی چـاك و جـوان بـوو دەیکوشـت. لـە نێـوان ئـەو هـەموو مەترسـییەدا دکتـۆر سـەری داخـست و هـەنگاوی هەڵدەهێنایـەوە. گومـانی لـەئـازاد کردنـی مێردەکەی لویسدا نەبوو.

---

٨- گالیۆتین کە لە پەرتوکەکانی ناوچەی خۆماندا بەگیوتین ناسراوە، کەرەسەیەکی کوشەندەیە کە بۆ سەربڕینی مرۆڤ دروستکراوە. دیارە لە زیندانەکاندا لەو کەرەسەیە بۆ ئیعدام کەڵك وەرگیراوە. ئەو کەرەسەیە بریتییە لە سەکۆیەك و دو کۆڵەکە لە پاڵیا تەورێکی دەمپانیش لە سەرەوە دێتە خوارەوە بۆسەر سەکۆکە کە لەوێدا هەر شتێك لە سەر سەکۆکەدا بێ، ئەیقرتێنێ.

## - ١٨ -

# دادگایی داڕنی

ساڵێك و سێ مانگ رابورد. پازده مانگی رێك لویس سەعات بە سەعات دڵی لەمشتیدا بوو. ئاخۆ رۆژی دواتر گالیۆتین سەری داڕنی نەقرتاندبێ؟ هەموو رۆژێك بە نێو شەقامی بە بەرد داڕێژراوی شاردا ئەڕابەی مەرگیان بە نێو خەڵکدا دەگێڕا و لە خەڵك پڕیان دەكرد و بەرەوپیری مەرگ بۆ ژێر تێغی تیژی ((گالیوتین)) یان دەبرد. کیژووڵەی ناسك ئافرەتی پاکداوێن، قژ رەش، قژ کاڵ قژ بۆر، پیاوی لاو و پیرەمێرد، هەژار و ئەشرافزادە یان هەر کەسی‌تر هەموو رۆژێ لە زیندانەکاندا دەردەکەوتن ودەکرانە خواردەمەنی ((گالیوتین)). خۆ برسێتی ((گالیوتین)) بەم زووانە تێر نەدەکرا)). ((ئازادی، بەرابەری، برادەری)) یان — مەرگ. کە لەم چوارە مەرگ لەگەڵ هەمووان هاوڕێیەتی دەکرد و بە ئاسانی دەستدەکەوت. ژیانێکی زۆر سەخت بوو بۆ لویس. ئەگەر یەك تۆز نائومێدی نیشانبدایە، ئەوا نەی دەتوانی بژی. بەڵام دژایەتی ئەرکەکانی ئەوی دەکرد. چاوەدێری باوکی و کچەکەی دەکرد هەر وەك ئەو کاتەی کە لە لەندەن دەیکرد. ئەو بە گوێرەی پێویست ئامۆژگاری لویسی بچکۆلەی ئەکرد لە بەر ئەوەی لە ئینگلتەرا لە ماڵی خۆیاندا بەسەلامەت پێکەوە بژین. لەراستیدا بۆ ئومێدواربوونیان بۆنەیەکی بەدەستەوە بوو. ئەمە بوو کە دکتۆر لە نێوان شۆڕش و شۆڕشگێڕاندا دارای رێز و خۆشەویستی بو هەر کە پەژارە و مەترسیەکانی دەخستە بەردەم ئەو، خێرا وەڵامێکی بۆ دەدۆزیەوە:

((بەبێ ئاگاداری من هیچ شتێك لە چارلز روو نادات. لویس خۆم دەزانم کە دەتوانم ئازادی بکەم)). رۆژێکیان لە کاتی هاتنەماڵەوەدا باوکی بە لویسی وت: ((روڵەکەم پەنجەرەیەکی بەرز لە زیندانەکەی دایە، کە هەندێ جار چارلز دەتوانێ بێتە ئەوێ. کاتێ کە دێتە ئەوێ (کە ئەمە رێکەوت نییە) ئەو لەوانەیە تۆببینێت ئەگەر

لە شوێنێکی باشدا کە خۆم بۆت دیاریبکەم رابوەستی ئەوا دەیبینی. بەڵام تۆ ناتوانیت ئەو ببینیت. روڵە گیان. ئەگەر چاویشت پێ بکەوێت نابێ هیچ ئیشارەتێ بکەیت کە لێت ئاگاداربن و پێت بزانن خەریکی چیت)).

((ئۆف باوکە گیان. ئەو شوێنەم پێ بڵێ. با هەموو رۆژێك برۆم)).

شوێنەکە شوێنێکی تاریك و پیس و چەپەڵ بوو کە لە کۆلیتی دار برێك نزیك بوو. لەو کاتەوە لە هەموو کەش و هەوایەکدا تا دووسەعات لەوێدا چاوەڕوانی دەکرد. کاتێك کە سەعات دەبوو بە دوو ئەو هەر لەوێ بوو و لە سەعات چواردا بەنائومێدی لەوێ دوور دەکەوتەوە. رۆژێك هەوا خۆش بوایە لویسە بچکۆلەکەی لەگەڵ خوی دەبرد. بەڵام ئەگەر هەوا ناخۆش بووایە بە تەنیا رادەوەستا. بەڵام قەد لە رۆژانی تاق نەدەچووە ئەوێ.

داربڕەکە پێشتر دروستکەری رێگە و بان بووە. بەڵام ئەمڕۆ لە بەر بژێوی خۆی خەریکی دار ورد کردنە کە بۆ سووتاندنی ورد دەکات. پاش ئەوەی کە چەند جارێك و لە هەمان کات و شوێندا ئەوی دیتەوە. ئەم جارەیان سەلامی کرد:

((رۆژ باش، هاوشاری)).

ژنەکە وەڵامی دایەوە: ((رۆژ باش. هاوشاری)).

ئەو بۆی دەچوو کە لە بەر چی دێت بۆ ئەوێ. ئیشارەتێکی کرد بۆ زیندانەکە و پەنجەکانی کێشا بە روومەتیدا بۆ ئەوەی نیشانبدات زیندانییەك لە پشتی تولەکانی پەنجەرەی زیندانەکەوەیە پەنجەکانی کردە تولی زیندان و لاسایی زیندانییەکەی کردەوە کە چۆن لە پشتی تولەکانەوە دەیڕوانییە دەرەوە.

دارشکێنەکە وتی: ((بەڵام خۆ ئەمە ئیشی من نییە)). درێژەی دایەوە بەدار ورد کردن.

رۆژی دواتر لویس کچەکەی خۆی هێنا بۆ ئەوێ. دیسان داربڕەکە هەرئەوی دیتەوە. تەورەکەی خۆی نیشان منداڵەکە دا. وتی گالیۆتینە بچکۆلەکەی منە، پێی نیشاندا کە ئەمە چۆن وەك گالیوتین کە سەری خەڵك ئەقرتێنێ، دارەکان لە یەك جیا ئەکاتەوە لویس هەستی بە دڵە خورپە کرد بەڵام هیچ مناقەشەی لە سەر نەکرد.

لەجیاتی ئەوە هەندێ پارەی پێدا. لە بەر ئەوەی کە ئەو نەیدەتوانی لە شوێنێکی‌تر وەك ئەو بێچاوەڕوانی بکات و تۆزێکیش لێی دەترسا. هەندێ جار ژنەکەی بۆ ئەوی دەڕوانی دەیدیت کە خەریکە بەردەوام چاوەدێری دەکات. کە کاتێکیش لای دەکردەوە بە لایەوە هەر ئەمەی دوپات دەکردەوە: ((ئەمە ئیشی من نییە)). و درێژەی دەدا بە داربڕەکەی خۆی.

لە هەموو کەش و هەوایەکدا، لە بەفر و سەرمای زستاندا، لە کزە و بارەشی بەهاردا. لە تیشکی گەرمای هاویندا و لە بارانی ساردی پاییزدا هەموو ڕۆژێك لویس دوو سەعات لەو شوێنەدا چاوەڕوانی دەکرد. مێردەکەی هەر بە پێی جاران یەك چاو چاوی پێدەکەوت (بەو شێوە کە لە باوکییەوە فێر بووبوو). هەندێ جار ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دەیدیتەوە. بەڵام جاری واش هەبوو بۆ یەك هەفتە ژنەکەی چاوی پێنەدەکەوت.

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی دیسامبردا، کاتێك کەژنەکە (لویس) لە شوێنی دیاری کراودا چاوەڕوانی دەکرد، باوکی هات بۆ لای.

((لویس، من هەر ئێستا لای چارلز بووم. ئەو دەچووە بەر پەنجەرەکە. بەڵام کەسێك نەبوو چاوی پێت بکەوێ. کەواتە ئەتوانی دەستی خۆتی بۆ ماچکەیت. بەم شێوە تۆ دەناسێ و دەت بینێ)).

لویس چەند جارێك دەستی خۆی بەرامبەر بە زیندانەکە ماچکرد.

((خۆشەویستم تۆ ناتوانی ئەو ببینی، دەتوانی؟)).

((نە باوکە گیان ناتوانم)).

دەنگی پێیەك بە سەر بەفرەکەدا هات. لایان کردەوە ژنێکیان چاوپێکەوت کە ملی ڕێی گرتبوو بێ ئەوەی لایان لێبکاتەوە تێدەپەڕی. ئەو ژنە مادام دیفارج بوو.

دکتۆر وتی: ((ئەی ژنە هاوشاری ڕێزم هەیە بۆت)).

((منیش ڕێزم هەیە بۆ تۆهاوشاری)). ئەمەی وەڵام دایەوە و وەك تارماییەك بە سەر بەفرەکەدا تێپەڕی کرد.

((لویس، وەرە با دەست خەمە سەر شانت با بڕۆین بە دڵی پڕ لە شادی و کامەرانییەوە بەرەو ماڵەوە. ئێرەش جێ بێڵین باشە! تا ئێستا باش بووە. تۆ تا ئێستا

سەرت بەرز بووە بە لەخۆبردوویی ئەویش بە بوونی تۆ سەربەرزە. گوێ رادێرە. من هەواڵێکی زۆر گرنگم پێیە. چارلز بەیانی بانگدەکرێت بۆ دادگا ئەو لە حەرەسخانەکەدا دادگایی دەکرێت.

((بەیانی!)).

((دەترسی؟)).

بە ترس و لەرزەوە وەڵامی دایەوە: ((ئومێدم بە تۆیە)).

دکتۆر وتی: ((ئومێد بە من. چاوەڕوانی درێژخایەنی تۆ بەرەو کۆتایی بوونە خۆشەویستم. ئەبێ لە چەند سەعاتی داهاتودا بۆت بێننەوە. من ئەبێ ئێستا لۆری ببینم)).

مستر لۆری بە تەمەنا چوو هێشتا هەر لە بانکەکەدا بوو. لە راستیدا ئەو هەر ئەوێی جێنەهێشتبوو. کتێبەکانی هەندێ جار بە دەستی باوەڕ پێکراوە رەسمییەکان بۆ دۆزینەوەی نیشانەکانی هەڵهاتووەکان هەر تاقیدەکرانەوە. ئەوەی کە لەتوانایدا بوو بۆ رزگار کردنی خاوەنەکەی رزگاریکردن. ئەو شایستەترین پیاو بوو کە تیلسۆنەکان لە ماوەی ئەو کاتە دژوارانەدا رەوانەی فەرەنسەیان کردبوو.

لەگەڵ مستر لۆریدا میوانێك هاتبوو کە حەزی نەدەکرد کەس چاوی پێبکەوێت. میوانەکە گوێی لەدەنگی نزیکبوونەوەی لویس و دکتۆر بوو بە پەلە هەستایە سەر پێ و خۆی لە هۆدەیەکی دیکەدا شاردییەوە. ئەو سایدنی کارتۆن بوو.. لەوێوە گوێ لە مستر لۆری بوو کە بەخێرهاتنی لویس و باوکی دەکرد و پەیتا پەیتا ئەوەشی دەبیست کە دەگوترا: ((هێنرایە حەمالْخانەکەوە و بۆ بەیانی ئاگادار کرایەوە)).

هەموو بەیانیەك لیستەی ناوەکان لەزینداندا دەخوێنرایەوە. هەروەها لە هەموو زیندانێکدا. ئەو ناوی ئەو زیندانیانە بوو کە دەهێنرانە ((حەمالْخانە)) و پاشان بۆ بەیانی رۆژی دواتر محاکمە دەکران.

چارلز دارنی، کە ماوەییەکی درێژ ((لە نهێنی))دا نەبوو، گوێی لە لیستەکەوە بوو کە چەند جار خوێنرایەوە. گوێی لە سەدان ناو بوو کەخوێنرانەوە سەدان کەسیشی دیت کە تێپەڕیان دەکرد و دەرۆیشتن. کە لە سەر نۆبەش نەبوو. لەکۆتاییدا گوێی

لەناوی خۆیەوە بوو.

((چارلز ئیڤرمۆند، ناسراو بە دارنی)).

ئەوانە بیست و سێ ناو بوون، بەڵام بەس بیست ناو وەڵامی دایەوە: بۆ یەکێك لە ناوەکان وتیان لەزینداندا مردووە بەڵام لە بیریان چووە، ئەو دوانەکەشیان پێشتر براون بۆ گالیۆتین.

دارنی هەنگاوی بەرەو پیش نا بۆ ئەو شوێنەی کە بانگکراوەکان دەچوون. چەند قسەیەکی بۆ ئەوانی‌تر کرد. بەڵام لێکبڕان زۆری نەخایاند. لەراستیدا لێکبڕان بەو شێوەیە گشتی بوو. بەڵام خۆ کەس ئاوڕی لێ نەئەدانەوە. ئەوان بەشێك بوون لە ژیانی بەندیخانەیی. دالآنی ((حەماڵخانە)) کە کورت و تاریك بوو. شەوی ناو هۆدەی تەنهایی (سلول) کپ و بێدەنگ شەوگاری درێژ و سارد بوو. ڕۆژی دواتر پازدە زیندانی پێش چارلز دارنی بران و بڕیاریان لە سەر سەپێنرا. دادگایی هەموو ئەو پازدە نەفەرە بە گشتی کاتی یەك سەعات و نیو کۆتایی پێهات. هەر پازدە نەفەرەکە نێردران بۆ گالیۆتینە.

لەکۆتاییدا سەرەی ئەو هات: چارلز ئیڤرمۆند،ناسروا بە دارنی، قازی و هەیئەتی مونسیفە ئاوڕیان لێدایەوە. بە دەستووری قازی گەورە ( قازی حاکم) هەیئەتی مونسیفە دانیشتن ((تەپلەی پەڕێنە))کانیان کردە سەریان. هۆڵی دادگاییەکە لەژنان و پیاوان پڕ بووبوو کە بریتیبوون لە، توڕەترین، زاڵمترین و بێدەسەڵاتترین خەڵکی پاریس. خەڵك بە دوای هەموو دادگاییکدا دەچوون بەڵام زۆر بە وردی و بە کەمی.هاوار و گریانی پەیتا پەیتای ئەوان بە حەق و بە ناحەق کاری دادگاکەی ڕاوەستاند. ئەوان وەحشیانەترین ((ئەشکەنجە))یان هەر حوکمێکیان بۆ کوشتن و بڕین ڕێز لێدەگرت. ئەو پیاوانە هەر یەکە و بەشێوەیەك چەکیان هەڵگرتبوو و هەمووشیان تەپلەیەکی سووریان کردبووە سەریان. هەروەها هەندێ لە ژنان چەقۆیان پێبوو، هەندێکیان تێر وپڕ بوون بە سەر و چاویاندا دیار بوو. هەندێکیان خەریکی دروومان بوون. لەنێوان ئەو ژنانەدا یەکێکیان خەریکی دوورین بوو کە شێوەی زۆر ناسراو بوو کە دارنی ناسییەوە لە پاڵ دیفارجدا دانیشتبوو. کە چرکە بە چرکە لەگوێی ئەودا

چپەی دەکرد: وا گومان دەکرا کە ژنی خۆی بێت.

لە لای خوارووی قازیحاکمەوە لە نێو دادگاکەدا دکتۆر مانێت دانیشتبوو کە جلی رەشی دادگای لە بەر کردبوو. تەنها یەك پیاوی تر هەبوو کەجلی عادی لە بەر کردبوو کە ئەویش مستر لۆری بوو.

چارلز ئیڤرمۆند، ناسراو بەدارنی وەك هەڵهاتوویەك تاوانبار کرا. لە سایەی یاسادا ئەبێ سزا بدرێت کەببێتە دەرسێك بۆ ئەو هەڵهاتووانەی دەگەڕێنەوە بۆ فەرەنسا. لەو کاتەی کەئەو گەڕاوەتەوە ئەو یاسایە گرینگییەکی ئەوتۆی نەبووە. ئەو هەڵهاتووەکە ئەبێ سزای مەرگی بۆ دابنرێ.

ئامادە بووان هاواریان کرد: ((سەری ببڕن. دوژمنێکی کۆمارکەیە!)).

بۆ ئەوەی هەراکە بێدەنگ بێت قازی گەورە (سەرۆکی دادگا) زەنگی لێدا. پاشان پرسیاری لەتاوانبارەکە کرد، ((ئایا ئەمە راستە تۆ ماوەی چەند ساڵێك لە لەندەن ژیاویت؟)).

دارنی وەلامی دایەوە: ((بە دڵنیایی، راستە)).

((کەواتە تۆ هەڵ هاتوو نیت؟)).

((بەپێی یاسا من بەمانای وتە هەڵهاتوو نیم. من هەرەشەم لە بەدکارییەکانی مارکۆس کردووە. لە بەر ئەوەی حەزم لێی نەبووە. من رۆشتم بۆ ئینگلتەرا بۆ ئەوەی بژێوی رۆژانەم بەدەستبێنم. حەزم نەدەکرد لە فەرەنسادا بەئیش و کارێکی پووچی خەڵکی فەرەنساوە بژیم. ئەمەش پێش هاتنی وشەی هەڵهاتوو بووە)).

((ئەی لەم بوارەدا تا چ رادەیەك سەرکەوتوویت؟)).

ناوی دوو کەس لە ئامادە بووانی، ((تیوفیل گابیل)) و ((ئەلکساندر مانێت))ی ناو برد.

((تۆ لە ئینگلتەرا ژنت هێناوە؟)).

((بەڵێ راستە. بەڵام خۆ ئەو ئافرەتێکی ئینگلتەرایی نەبوو. بەڵکو فەرەنسیە)).

((هاوشارییەکی فەرەنسی؟ ناوی خۆی و نازناوی چییە؟)).

((ناوی لویس مانێتە. تاقانە کچی دکتۆر مانێتە. کە بۆ هەموو کەسێك وەك دۆستێکی کۆمار ناسراوە. تەنها زیندانییەکەی زیندانی باستیل بووە)).

وەڵامەکە و هێنانی ناوی دکتۆر مانێت ئەسەری خۆیشی نواند لە دڵی خەڵکەکەدا. هەرا و هوریای خۆشحاڵی لە بیرەوەریەکانی دکتۆر ناو هۆدەکەی پڕکرد. خەڵك کەماوەیەك لەوە پێش رق و بێزاری خۆیان بەرامبەر بە تاوانبارەکە دەنواند ئێستا دەستیان کرد بە پێکەنین.

قازی حاکم پرسیاری کرد: ((بۆچی، گەڕایتەوە بۆ فەڕەنسا، کەی گەڕایتەوە؟ ئەی بۆ پێشتر نەگەڕایتەوە؟)).

((خێرا نەگەڕامەوە بۆ فەڕەنسا. لە بەر ئەوەی کە مەبەستم ژیان لە فەرەنسەدا نەبوو. بەڵام لە ئینگلتەرا بۆخۆم دەژیام و لەوێش دەرسی ئەدب و زمانی فەرەنسیم دەگوتەوە. ئێستاش لە بەر نامەیەك گەڕاومەتەوە کە هینی هاوشارییەکی فەرەنسییە کە ژیانی لەمەترسیدا بوو بە هۆی بزر بوونی منەوە. گەڕامەوە کە تێبکۆشم ژیانی ئەو رزگار بکەم. بۆیە خۆم داناوە بۆخۆڕاگرتن لەهەر چەشنە مەترسییەك کە روو بە رووم دەبێت. ئایا ئەمە بۆچونی کۆمارە، کە ئەمە جینایەتە؟)).

خەڵکەکە هاواریان کرد: ((نە!)) دیسان قازی حاکم زەنگی لێدایەوە. بەڵام تێکڕا هەر هاواریان دەکرد ((نە!)). تا هیلاك بوون.

قازی حاکم پرسیاری کرد: ((ناوی ئەو هاوشارییە چییە؟)).

((یەکەم شایەتی منە. هاوشاری گابیلە. نامەکەی مانسیۆر گابیل بێ شك لە نێو بەڵگەنامەکانی بەردەم قازی گەورەدایە)).

دکتۆر پشت راستی کردەوە کە نامەکە ئەبێ لەوێ بێت. بۆیە پێشکەش کراو خوێندرایەوە.

هاوشاری گابیل بانگکرا.

((هاوشاری گابیل. ئەمە نامەی تۆیە؟)).

((بەڵێ ئەوەتە. ماوەی چەند مانگێك لە زیندانی ((ئەبایی))دا بەبێ دادگایی راگیرام. منیش پاش ئەوەی کە هاوشاری ئیڤرمۆند زیندان بکرێت ئازاد کرام)).

لە دکتۆر مانێت پرسیار کرا، وەڵامی پاك و خاوێنی و کەسایەتی گۆرانکارییەکی زۆر باشی پێشکەشکرد. ((هاوشاری ئیڤرمۆند. یەکەمین دۆست و هاوڕێ من بوو لە

ئینگلتەرا. ئەو هەمیشە بۆ من و کچەکەم جێی باوەڕ بووە. ئەو هیچ پێوەندییەکی بەدەسەڵاتدارێتییەوە نییە. ئەو لەوێ دادگاییان کرد بە تاوانی ئەوەی کە ئەو دوژمنی ئینگلتەرایە. مستر لۆری کە پیاوێکی ئینگلتەراییە، کە ئێستا لێرە حازرە لە نێو دادگاکەدا لەو کاتەدا لەو دادگایەدا بوو، ئەتوانێ وەك شایەدێك ئەم راستییە بسەلمێنێ».

پاش بیستنی هەموو ئەمانە. هەیئەتی مونسیفە بڕیاریاندا کە بەگوێرەی پێویست شتیان ببێت بۆیە ئەوان ئامادە بوون رای خۆیان دەربڕن لە حاڵێکدا کە قازی گەورە هیوادار بوو بڕیاری باش بدات. قازی گەورە وتی چاوەڕوانە و هیوادارە.

هەیئەتی مونسیفە یەك لەدوای یەك بڕیاری خۆیان راگەیاند. لەگەڵ هەر رایەکدا کۆمەڵە خەڵکەکە هەڵدەستانەوە هاواریان دەکرد. هەموو راکان بەدڵی زیندانییەکە بوو. بۆیە قازیش روونی کردەوە کە ئەو پیاوە ئازادە.

قیژە و هەرایەکی مەزن لە هوڵەکە بەرز بوو. فرمێسکی ئازادی دارژا و سەدان کۆمەڵی خەڵك بە دەوران دەوری دارنی کۆ بوونەوە. بە زەختێکی زۆر لە دەستی ئەوان رزگاری بوو. ئەمانە ئێستاش هەر ئەو خەڵکەن کە ئامادە بوون لە ناو شەقامدا لەگەڵ پارێزەرەکانیدا لەت و کوتی کەن.

هەر ئەونە دارنی دوور خرایەوە پێنج کەسی تر خێرا جێگەکەیان لێگرت. ئەوانە ئەبێ وەك دژ بە کۆمارێك محاکمە بکرێن. بۆیە وەك وشەیەك یان وەك راستییەك هاوکاریان ناکرێت. محاکمەکەیان زۆری نەخایاند. پێش ئەوەی کە دارنی بە روونی حوکمەکەی وەرگرێت ئەوان حوکمی مردنیان بەسەردا سەپێنرا.

زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە دادگاکەی دارنی ئامادە ببوون هاوڕێی ئەویان کرد بۆ نێو شەقامکە. لەوێ لەگەڵ کەسانیتر یەکیان گرتەوە. کە هەموو شاد و دەم بەپێکەنین بوون. بەڵام روالەتی دیفارج و ژنەکەی تێدا دیار نەبوو.

خەڵك بە پاڵ دارنییان خستە سەر کورسییەك و هەڵیان گرتە سەر شانیان. پاشان لە رەوتێکی بەکۆمەڵدا کە بە دوایاندا سەدان خەڵکی هاوشاری دڵخۆش دەهاتن. چارلز هێنرایەوە بۆ حەوشەی ماڵی دکتۆر مانێت. پاشان دانرایە سەر زەوی و بەرەو پلیکانەکان رۆیشت. بەرەو ئەو شوێنەی کە ژنەکەی چاوەڕوان بوو. کاتێك کە

خەڵکەکە چاویان لێبوو باوەشی کردەوە. بۆ (ژنەکە)ی نیگای کزی و لاوازی‌یان تێدا دیتەوە. لە خۆشیدا ژنان و پیاوان یەکتریان ماچکرد و هەموویان دەستیان کرد بە هەڵپەڕکێ و هەڵخستنەوە لەخۆشیدا.

کاتێك کە ماوەیەك بەمەوە رایان بوارد، ئەمجا ژنە جوانکیلەکەیان خستە سەر کورسییەك و هەڵیان گرتە سەر شانیان. بۆیە وەك شاژنێکی ئازادیخواز هەڵیان نا. لەدواییدا هەموو خۆیان جیا کردەوە هەر بە خۆشی و هورت و هەرا لەوان دوور کەوتنەوە و هەر یەکەو بۆ شوێنی خۆی گەڕایەوە.

لویس گەشابۆوە. هەردووکیان بۆ ماوەیەکی درێژ هەر سەیری یەکتریان دەکرد.

دارِنی لەتویَ دڵ وتی: ((لویس ، ئەی هینی خۆم! خۆ رزگاریمان بوو!)).

((خۆشەویستەکەم، دارِنی! دەبا شوکری خودا بکەین کە تۆی لە ناو ئەو هەموو خەتەریاتەدا هێنایە دەرەوە)).

هەر دووکیان سەریان بەرزۆ کرد و شوکری خوایان کرد. لویسی بچکۆلە بە دەستی خاتوو پرووس هەڵگیرا بۆ ئەوەی ماچبکرێت. باوەشی کرد بە ملی باوکیدا و نەی هێشت بڕوات.

پاشان، بێدەنگ هەر دووکیان خۆشحاڵ و سەربەرز، دکتۆر مانێت بە هاوڕێی مستر لۆری کە دوا بە دوای دەهات. بە گەرمی پیرۆزباییان لە دارِنی کرد.

دارِنی بە لویسی وت: ((ئێستاش، هەی خۆشەویستم دەبێ سوپاس و پێزانینی باوکت بکەین نەك ئەو پیاوەی کە لە فەرەنسادا دەسەڵاتیشی هەبوو بەڵام هیچی نەکرد)).

لویس سەری نا بە سنگی باوکییەوە بێ ئەوەی هیچی پێ بڵێ. وەك ئەو کاتەی کە ماوەیەکی زۆر زۆر لەمەوپێش سەری دەنا بە سینە و مەمکی باوکییەوە لە پاریس.

وتی: ((خۆشەویستم، تۆ نابێ لاواز بکرێیت. قەت نەترسیت پێم نەوتیت هەر ئەبێ ئازادی بکەم؟ باشە ئەوا ئازادم کرد)).

## - ١٩ -

# تەقە دەروازەیەك

گەرچی دارِنی ئازاد کرابوو، بەڵام لویس هەر دڵنیا نەبوو هەستی بە شادمانی نەدەکرد. بۆیە دڵی هەر لە مەترسی دا بوو. خەڵکی بێگوناح و هەر هێشتا مەحکووم بە مەرگ دەکران کەسانێکی بێتاوانی وەك مێردەکەی ئەو. هەندێ کەسانی خۆشەویستی وەك خۆشەویستەکەی ئەو هەموو رۆژان بەشە چارەنووسی ئەوتۆیان پێ دەبەخشرا کە ئەوی لێ رزگار بوو.

باوکی بە شێوەی جۆراوجۆر هەستی دەبزوا، ئەو، ئەو ئەرکەی کە لە سەری بوو بە ئەنجامی گەیاند. بۆ خۆی بەراوردی ئەرکەکەی کرد و وەعدەی دا کە چارلز ئازاد بکات. دەبووا هێزی خۆی بەتوانا کردبا. ئەویش دەیویست کەسانی دیکەش لەو موشکیلەدا پێوەندیان پێوە هەبووایە.

خاتوو پرووس و جێری کرانچر خۆیان ساز دابوو لە ماڵەوە بچنە دەرەوە و بۆ کڕینی خواردەمەنی لە دوکانێکی بەو نزیکەدا خاتوو پرووس راوەستا کە پرسیارێك لەدکتۆر مانێت بکات: «ئەی باشە هێوایەك هەیە بە مانەوە و ژیان لەم شوێنەدا؟».

دکتۆر وەڵامی دایەوە: «دەترسم نەبێت. ئەگەر چارلز بیەوێت لێرە بڕوات لەوانەیە بۆ چارلز ئەرکی تێدا بێت».

خاتوو پرووس وتی: «باشە، ئەبێ بە هیوا و چاوەڕوان بین مستر کرانچیر؟».

رۆیشتنە دەرەوە و لویس و مێردەکەی و باوکی و منداڵەکەیان لە پاڵ ئاگری زۆپاکەدا بەجێهێشت. چاوەڕوان دەکرا مستر لۆری بەم زووانە لە بەنك بگەڕێتەوە. هەموو شتێك هێمن و بێدەنگ بوو. لویس ئەوەندە هەستی بە حەسانەوە دەکرد کە تا ئێستا قەت وا نەبووە.

لەناکاو هاواری کرد: «ئەوە چییە؟».

باوکی، دەستی هێنا بەقژیدا و وتی:))کچم. خۆشەویستم لەسەرخۆ بە!)).

((دەنگی پێیەکی زلە لەگوێمدا زرنگایەوە، لە سەر پلیکانەکان دەهات)).

((کچم، پلیکانەکان تەواو بێدەنگن)).

هەر کە باوکی ئەوەی گوت، تەقەیەك دەرگاکەی هەژاند.

دکتۆر چرا قوتولەیەکی هەڵگرت و رۆیشت دەرگاکە بکاتەوە. لویس هەر هێشتا لە ترساندا دەلەرزی. لەدەرەوە چوار پیاوی زەبەلاحی تەپلە سووری دیت کە بە شمشێر و نێزە چەکدار بوون.

هەر کە دەهاتنە ژوورەوە یەکەم کەسیان وتی:))هاوشاری ئیڤرمۆند، ناسراو بە دارِنی)).

دارِنی وەڵامی دایەوە: ((کێ ئەوی دەوێت؟)).

((من ئەوم دەوێ ئێمە ئەومان دەوێ. دەتناسم. ئیڤرمۆند من ئەمرِۆ تۆم لە دادگاکەدا دیتووە. تۆ هەر ئێستاش هەر زیندانییەکی کۆمارەکەیت)).

هەر چواریان دەوریان گرت. لەم کاتەدا خۆی و ژنەکەی و منداڵەکەی باوەشیان کردبوو بە یەکدا.

((پێم بڵێن، من بۆچی ئێستاش هەر زیندانیم؟)).

((هەر ئەوەندە بەسە کە لەگەڵ ئێمەدا بگەرِێیتەوە. بەیانی خۆت تێدەگەیت. بەیانیش دادگایی دەکرێیتەوە)).

دکتۆر مانێت وەك بەرد وشك بوو. هەر وەك پەیکەرێك چراکەی گرتبوو بەدەستیەوە راوەستابوو.. پاش ئەم چەند قسە چراکەی دانایە زەوی و رووی کردە قسەکەرەکە.

دکتۆر وتی: ((تۆ دەزانی من کێم؟)).

((بەڵێ، دەزانم دکتۆری هاوشاری)).

((تۆ لەدواییدا وەڵامی پرسیارەکانی ئەوم پێ دەدەیتەوە؟ ئەمە چۆن سەری هەڵداوە؟)).

بەلاسارییەکەوە یەکەم پیاو وتی: ((دکتۆری هاوشاری، ئەو لە لایەن خەڵکانی

بارەگای شەقامی ئانتۆینە تاوانبار کراوە. ئەم هاوشارییە)). ئیشارەتی کرد بۆ کەسی دووهەم کە خەریك بوو دەهاتە ژوورەوە ((ئەمە لە شەقامی ئانتۆینەوە هاتووە)).

دووەم کەس تەقەی لێدا ((ئەو لە لایەن شەقامی ئانتۆینەوە تاوانبارە)).

دکتۆر پرسیاری کرد: ((لەپێی چی؟)).

پیاوی یەکەم وتی: ((دکتۆری هاوشاری، زیاتر پرسیار مەکە ئیڤرمۆند ئیمە زۆر بە پەلەین)).

دکتۆر داوای کرد: ((تۆزێ بوەستن. ئەکرێ پێم بڵێن کێ تاوانی داوەتە پاڵی)).

((ئەمە پێوانەی رەواڵە. بەڵام ـ قەینا ـ ئەو لەلایەن ژن و پیاوێکی هاوشاری بە ناوی دیفارجەوە تاوانبارە. هەروەها یەکێکی دیکەش)).

((ئەوی دیکەش کێیە؟)).

ئەو پیاوە کە لە شەقامی ئانتۆینەوە هاتبوو وتی: ((بەیانی وەڵامەکەی دەگرێتەوە)).

## - ٢٠ -

# خاتوو پرووس براکەی خۆی دەدۆزێتەوە

خاتوو پرووس بێ ئەوەی ئاگای لەوە بێت کە لە ماڵەوە چی روو دەدات بەناو شەقامێکی تەسك و تروسکدا بەڕێوە بوو. ئەو هەر بیری لەوە دەکردەوە کە دەبوا بیکڕێ و بیبا بۆ ماڵەوە. مستر کرانچیڕێیش شان بەشانی ئەو هەر دەڕۆیشت، کە سەوەتەکەی بۆ هەڵگرتبوو.

لەکاتێکدا کە بە ناو شەقامەکەدا تێدەپەڕین سەیری هەر دووکانێکیان دەکرد. بەڵام خۆ ئاگاداریش بوون لەوەی کە خۆیان لە هەر کۆمەڵێکی خەڵك بپارێزن.

خاتوو پرووس هەندێ شتی خواردەمەنی و بازێ رۆنی بۆ چراوکەکە کڕی. پاشان بیری کەوتەوە کەئەبێ هەندێ خواردنەوەش (شەراب) بکڕێت. سەری کرد بە هەندێ لە شەرابفروشەکاندا بەڵام لە بەر ئەوەی کە قەرەباڵغ بوون و خەڵکی زۆری تێدا بوون نەدەچووە ماڵەوە. لەکۆتاییدا دوکانێکی پەیدا کرد کە هێمنتر بوو، تەنها چەند مشتەرییەکی تێدا بوون. بۆیە لیرەدا چووە ژوورەوە.

چەن کەسێکی تێدا بوو کە زۆربەیان چەکدار بوون. هەندێکیان خەریکی یاری کارت(پاستۆر) بوون. یەکێکیان خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامە بوو بەدەنگی بەرز کە ئەوانیتریش گوێیان لێگرتبوو. یەك دوو کەسی دیکەش لە سەر کورسییەکانی خۆیان خەویان لێکەوتبوو.

خاتوو پرووس و جێری خۆیان نزیك کردەوە و پرسیاریان کرد بۆکڕینی ئەو شەڕابەی کە دەیانویست.

کە خەریك بوون شەرابەکەیان بۆ دەکێشان، پیاوێك خۆی لەوانیتر جیا کردەوە و لە سووچێکەوە هەستایە سەرپێ کە بڕواتە دەرەوە. لە چوونە دەرەوەدا. لەگەڵ خاتوو پرووس رووبەڕوو بووەوە، زۆر چاوی لێ زەق نەکردبووەوە کە خاتوو پرووس هاواریکرد.

هـەر کەسـە و بـۆ خـۆی ئـاوڕی دایـەوە کـە داخـوا چـی قـەماوە. ئـەوان تـەنها ژن و پیاوێکیان دیت کە لە یەك زەق ببوونەوە: پیاوەکـە ڕێـك لـە فەرەنـسی ئەچـوو. ژنەکـەش بێشك کە ئینگلتەرایی بوو.

خاتوو پرووس هاواری کرد: ((ئۆف، سـولۆمۆن. سـولۆمۆنی خۆشەویـستم. پـاش ئـەو هەموو ساڵانەی کە چاوم بە چاوت نەکەوتووە، ئەوە منم تۆم دۆزیوەتەوە؟)).

پیاوەکە بە تووڕەیی و بە ترس و لەرزەوە وتی: ((بانگم لێ مەکە سولۆمۆن، تۆئەتەوێ من بە کوشتن بدەیت؟)).

خاتوو پرووس هاواری کرد: ((برا گیان، برا گیان! چۆن ئەتوانیت داوایەکی ئاوا زاڵمانەم لێبکەیت؟)).

سولۆمۆن وتی: ((دەی کەواتە دەمی خۆت بگرە، ئەگەر ئەتەوێت لەگـەڵ مـن بـدوێیت وەرە دەرەوە با قسەت لەگـەڵ بکـەم. پـارەی شـەرابەکەت بـدە و وەرە دەرەوە. ئـەو پیـاوە کێیە؟)).

خاتوو پرووس، سەرێکی بە پەژارەوە بۆ برا بێ ڕەحمەکـەی ڕاوەشـاند و وتـی: ((مـستر کرانچێر)).

سـولۆمۆن وتـی: ((ڕێگـەم بـدە بـا بێمـە دەرەوە. تـۆ بڵێـی وا بـیر بکاتـەوە کـە مـن ڕۆحیێکم؟)).

مـستر کرانـچێر وەك ڕۆحیانـەتێکی دیتبێتـەوە هـەر سـەیری بـەژن و بـاڵای دەکـرد. ئەوندەش بە لایەوە سەیر بوو کە هـەر چـاوی لـێ نەدەبەسـت. سـەرەڕای ئـەوەش هیـچی نەدەگوت. هەر کەوتە دوای خاتوو پرووس و هاتە دەرەوە لەدوکان.

لەهەمان کاتدا کە دەهاتنەدەرەوە. مستر سولۆمۆن لای کردەوە بە لای خەڵکەکـەدا و پێی وت بە زمانی فەرەنسی کە هەر یەکە و خەریکی ئیشی خـۆی بێـت و برواتـەوە سـەر شوێنی پێشوی خۆی.

سولۆمۆن لەسوچێکی تاریکی شەقامەکەدا ڕاوەستا و وتی: ((ئێستا چیت دەوێت؟)).

پروسی هەژار وتی: ((تۆ چەندە بەبێ بەزەییانە لەگەڵ من دەدوێیت!)).

سولۆمۆن سەری داخست و ماچێکی بچکۆلەی دایە.

((ئیتر! ئێستا له خۆت رازیت؟)).

خاتوو پرووس سەرێکی بۆ لەقاند و لە دڵەوە بە بێدەنگ گریا.

براکەی وتی: ((ئەگەر وای بۆ دەچی کە من سەرم سورِ بمێنێ، وا نییە، من دەمزانی کەتۆ لێرەیت. ئەمە ئەرکی منە کە بزانم ئەو لاوەکیانە لێرە چ دەکەن. ئەگەر ناتەوێ ژیانی من بخەیتە مەترسییەوە. تا ئەو جێگەی کە بۆت دەکرێ بە خێرایی ملی رێگە بگرە و برِۆ. با منیش برِۆم بە لای کاری خۆمەوە. چۆن من ئیشم هەیە. من باوەرِپێکراوم)).

خاتو پرووس وتی: ((تەنها یەك وشەی دڵنیاکەرەوەم پێ بڵێ)).

کرانچێر وتی: ((یەك تاو راوەستە! جارێ مەرِۆ. ئەمەوێ هەستی خۆتت لێ بپرسم. ناوت جۆن سولۆمۆنە یا سولۆمۆن جۆن؟)).

سولۆمۆن بە نارِەزاییەکی گەورەوە لای کردەوە بەلایەوە.

کرانچێر وتی: ((وەرە! بڵێ جۆن سولۆمۆن یا سولۆمۆن جۆن؟ ئەو بانگی کردی سولۆمۆن. دەبێ بزانێ. دڵنیایت کەخوشکی تۆیە. منیش دەزانم تۆ چۆنیت. هەر ئەوەی کە لە پێشەوە دیت؟ ئەی دەربارەی ناوی پرووسەوە چی؟ کە لە ئینگلتەرادا ناوی تۆ نەبوو)).

((مەبەستت چییە؟)).

((دەزانم ناوت پرووس نییە. ناتوانم و بیری بهێنمەوە کە خۆتت ناو نابوو چی؟ هەروەها ئەو هاورِێکەشت کە ناوێکی کورتکراوەی هەبوو. ئێستا تۆ لەو کاتەدا خۆت ناو نابوو چی؟)).

دەنگێکی مرِ وەڵامی دایەوە ((بارساد!)).

جێری وتی: ((ئەوەتە! بارساد!)).

سایدنی کارتۆن بە پێوە وەستابوو هەر دوو دەستی لە پشت ملیەوە گرێدابوو. بێدەنگ و دڵ پەشێو بوو. لەوکاتەدا وتی: ((بەڵێ، بارساد)).

سایدنی وتی: ((پرووس خوشکی خۆشەویستم، زویر مەبە. دوێنێ ئێوارە رۆیشتمە ئیدارەکەی مستر لۆری. ئێمە برِیارماندا کە چیتر من خۆم بە بنەماڵە نیشاننەدەم تا وەزع باشتر بێت. یان تا ئەو کاتەی کە بایەخم پێبدرێت. ئێستاش هاتووم لەگەڵ براکەتدا

هەندێ وت و وێژ بکەم. واش دەزانم براکەت ئیش و کاری باشتر بێت. هیواداریشم لە بەر خاتری تۆش بێت جاسووسی پۆلیس نەبوبێت)).

جاسووس، ئەوەی کە رەنگی پەڕیبوو، بە رۆحی تۆقیوە لای کردەوە: ((چۆن جورئەت ئەکەن شتی وا ئەڵێن؟)).

سایدنی وتی: ((پێت دەڵێم، من تۆم دیت کە لە حەماڵخانەکە سەعاتێك یان شتێ زیاتر هاتیتە دەرەوە. رواڵەتێکت بوو کەئێستاش هەر بیرم دەکەوێتەوە. من هەر رواڵەتێکم لە بیر دەمێنێ. من پێم سەیر بوو چۆن لە زینداندا هاتیتە دەرەوە. من بیرم دەکەوێتەوە کە تۆش پێوەندیت بە قوربەسەریەکانی رابوردووی مستر دارنیەوە هەبوو لە لەندەن. بۆیە کەوتمە دوات، هەر بەم بۆنەشەوە بە دواتەوە بووم تا چوویتە نێو دوکانە شەرابفرۆشەکەوە. لەپاڵتاندا دانیشتم و گوێم لە هەموو داستانەکانتان گرت، هەروەها ئەوانەش کە لەبارەی تۆوە دەگوترا. هەر لەو رێگەوە بۆم دەرکەوت کە شێوەی سروشتی دامەرزاندنەکەی تۆ چۆنە. بۆیە هێدی هێدی هەڵوێستم وەرگرت، مستر بارساد)).

((کام هەڵوێست؟)).

((لەوانەیە ئازار درابیت، لەوانەیە دوان لەو بارەوە لەم سەر شەقامەدا زۆر خەتەرناك بێت. دەبێ تکات لێبکەم چەند دەقەیەك برۆین بۆ بارەگاکەی مستر لۆری؟)).

((ئەی ئەگەر نەیەم چی؟)).

((وا دەزانم باشترە بێیت. ئەگەر نەشێیت، ئەوا خۆت دەخەملێ)).

جاسووسەکە بەخۆگرژکردنەوە رووی کردە خوشکەکەی و گوتی: ((ئەمانە هەمووی خەتای غەڵەتەکانی تۆ بوو)).

سایدنی وتی: ((نەك هەر هەمووی بەڵکو هەلویستی رێزدارانەی من بەرانبەر بە خوشکەکەتە کە من هاندەدات ئاوا لەگەڵتا رەفتار بکەم. ئێستا دێیت؟)).

((گوێ دەگرم لەوەی کە دەتانەوێ بلێن. بەڵێ دێم)).

((دەی پێشنیار دەکەم خوشکەکەت بەرین بۆ شوێنەکەی خۆی لەو شەقامەی کە تێدا دەژی. ماوەم پێبدە با قۆڵ کەم بە قۆڵتا خاتوو پرووس. پاریس بۆ ئەو کەسانەی کە تێدا نەبوون شوێنێکی خراپە. کەس لایەنگریت ناکات و هەر بەو بۆنەشەوە کە جێری شتێك لە

بـارەی مـستر بارسـادەوە دەزانـێ، هـەروەها ئـەویش دەعـوەت دەكـەم بـۆ ئـەوێ تـۆش ئامادەیت؟ كەواتە وەرە)).

لەكاتێكدا كە بەرەو پێشتر هەنگاویان دەنا، خاتوو پرووس سـەیری رواڵـەتی كـارتۆنی كرد و داوای لێكرد نابێ هیچ ئازارێك بـەبراكـەی بگەیـەنێ. ئـەو (خـاتوو پـرووس) بـۆی دەركەوت كە ئەویش نیگایەكی دیاریكراوی هەبێت. بۆیە ئەگەر بیەوێت بڕیارێكی مـەزن بدات بێگومان نیازەكەی ئەو دەگۆڕێت. ئەویان (خاتوو پرووس) هاوڕێیەتی كرد هەتا سـەر سوچی شەقامەكەی خۆیان و پاشان بـەرەو دەفتەرەكـەی مـستر لـۆری رێنـوێنی كـرا. كـە ئەمەش چەند دەقەیەكی خایاند.

جان بارساد (ئەو كەسەی كە ناوی سولۆمۆن پرووس بوو) شان بەشانی هەنگاوی دەنا.

مستر لۆری هەر ئەو كاتە نانی ئێوارەی خواردبوو لە پاڵ نركەی زۆپاكەدا دانیـشتبوو. سەیری بڵێسەی ئاگرەكەی دەكرد و یادی رابوردووی دەكردەوە. لەوكاتەدا كە ئەوان هاتنـە ژوورەوە لای كرد بە لایانەوە بۆیە بە دیتنی ئەو لاوەكییە(غەریبە) سەری سوڕما.

سایدنی وتی: ((گەورەم، براكەی خاتوو پرووسە خۆی ناو ناوە مستر بارساد)).

ئەو پیاوە ماقووڵە پیرە دووپاتی كردەوە: ((بارساد؟ بارسـاد؟ وا دەزانم ئـەوناوە و ئـەو وێنەیەم دیتبێت)).

سایدنی بە كزێكەوە وتی: ((پێم وتیت ناو وێنەی تۆ زۆر بەئاسانی وەبیر دێتەوە. مستر بارساد! تكایە دانیشە)).

كاتێك كە سەندەڵییەكەی بۆ خۆی دانا، بەم كارەی یارمەتی مستر لۆری دا كـە بـیری كەوێتەوە بڵێ: ((بارساد شایەتێك بوو لە دادگاییەكەی لەندەندا)).

مستر لۆری بە خێرایی بیریكەوتەوە. بۆیە چاوی تێبڕی بە نیگایەكی قووڵی ناحەزانەوە سەیری ئەو تازە هاتووە كرد.

سایدنی وتی: ((ئەمە خوشكەكەی خۆی كە ماوەیەكی زۆرە لێـی ونبـووە. ناسـییەوە. ئەویش هەر بە هۆی خۆشەویستی و هەستی برایەتییەوە بوو. و ئەویش ئـەو پەیوەندییـەی دان پیانا. من دوو هەواڵی ناخۆشم پێبوو. داڕنیش دیسان دەستگیر كراوەتەوە!)).

((چـی دەڵێـی؟ خـۆم هـەر دوو سـەعات لەمـەوپێش ئـەوم بـە سەرمەسـتی و سـاغ و

سەلامەت لەماڵەوە جێمهێشتووە بەهیواش بووم بڕۆمەوە بۆ لای ئەو)).
((ئەو جارێکیتر گیراوەتەوە. مستر بارساد کەی گیراوەتەوە؟)).
((ماوەیەکی کورت لەمەو پێش)).
((بێگومان کە هیچ کەس لە مستر بارساد باشتر نازانێ.خۆم گوێم لێبوو لەناو مەیخانەکەدا ئاماژەی بۆ کرد. ئەو داڕنی دیوە کە دەبرا بۆ حەماڵخانەکە)).
مستر لۆری تا ئێستاش هەر بێدەنگ و پەشێو بوو.
سایدنی وتی: ((ئێستاش، مستر بارساد هیوادارم کە ناو و رێزی دکتۆر مانێت سبەینێ لەئەمڕۆ کەڵك هێنەرتر بێت لە دادگاییەکەی بەیانیدا)).
((هیوادارم وابێت)).
((بەڵام، لەم کاتەدا شتەکان لەوانەیە جیاواز بن. لێرەدا سەرنجێك هەیە ئەویش ئەوەیە کە لەوانەیە دکتۆر ئەم جارەیان نەتوانێ لە ئەو بەند کراوە پشتیوانی بکات)).
مستر لۆری وتی: ((لەوانەیە ئەو نەیزانیبێت کە دەستێکی تاوان ها بە دوایەوە)).
((بەڵام، ئەمەش سەرنجێکی خراپە. لەکۆتاییدا ئەمە هەڵێکی زۆرپڕ مەترسییە، هەروەها لەوانەیە ببێتە یاریکردنێکی پڕ مەترسی. با مەجال بدەین بە دکتۆر یارییەکی خۆی دەستپێبکات و منیش بۆ خۆم خەریك دەبم. گیانی هیچ پیاوێك بە قەد ئەوە بایەخی نییە. ئەمڕۆ کەسێك نەبووە خەڵك هەڵیبگرێت بیباتەوە بۆ ماڵ و پاشان بیگەڕێنێتەوە بۆ زیندان و سبەینێ بۆ ژێر گالیۆتینە. ئێستاش ئەگەر ئەو نەگبەتییە روویدا، پێویستم بەیارمەتی دۆستێك دەبێ لەحەماڵخانەدا ئەو شوێنەی کە داڕنی ئەبێ تێدا دادگایی بکرێتەوە. بۆیە ئەبێ لە دەسەڵاتی مستر بارساد کەڵك وەرگرم. ئەمەش وەك یارییەکی کارت (پاستور) وایە لە نێوان من و مستر بارساددا کە ئەگەر من یاریەکە ببەمەوە ئەوا ئەبێ لە یارمەتی ئەو کەڵك وەرگرم)).
جاسووسەکەش وتی: ((تۆ پێویستیت بە یارییەکی زۆر باش هەیە بۆ بردنەوەی ئەو یاری کارتە!)).
((من کارتەکانی خۆمت پێ نیشاندەدەم مستر لۆری، تۆ بە لاوازی من دەزانی شەڵڵا هەندێ کونیاکت پێ بدامایە)).

ئەوەش خرایە بەردەمی، پەرداخێکی لێ خواردەوە و لە سەرخۆ قاپەکەی خستە ئەولاوە. پاشان درێژەی پێدا، هەر وەك ئەوەی کە خەریکی یاری کارت بێت و لە سەرخۆ سەیری کارتەکان بکات درێژەی بەقسەکانی دەدا. کە وتی: ((مستر بارساد. تۆ جاسووسی پۆلیسی، بەڕێوەبەری یەکێك لە کۆمیتەکانی کۆمارییەکانیت. بەڕێوەبەرێکی نهێنیت ـ بەڵام تۆ لە ناوێکی درۆیی (نازناو) کەڵك وەردەگریت کە ئەمەش کارتێکی زۆر باشە بۆ من زۆر بە کەڵکە. مستر بارساد کەئێستا لە خزمەتی حکوومەتی کوماری خوازەکانی فەڕەنسادایە، لەوە پێش هەر ئەو شەخسە نۆکەری حکوومەتی ئینگلتەرا بوو. کەئەمەش هەر کارتێکی بە کەڵکە بۆ من. بۆ چی؟ لە بەر ئەوە کەزۆربەی کەس، وا بیر دەکەنەوە کە ئەو نۆکەرایەتییە ئێستاش هەر بەردەوامە بۆ حکوومەتی ئینگلتەرا، و ئێستاش هەر جاسووسی کەواتە ئەوە دوژمنێکە لەناو دڵی فەڕەنسادا. ئەمە کارتێکە کە ناتۆپێ. بەڵێ مستر بارساد یارییە کارتەکەی من ئەمەیە)).

بارساد وتی: ((باشە پێشنیاری ئەو یارییە لای تۆ چۆنە؟)).

((یەکەم جار چاکترین کارتم دەخەمە یارییەکەوە. بە نزیکترین کۆمیتەی کۆماری دەڵێم مستر بارساد دژ بە گۆمارە. دوژمنێکی فەڕەنسایە. سەیرێکی کارتەکانت بکە مستر بارساد، بزانە چیت هەیە. هیچ پەلە مەکە)).

قاپەکەی کێشایە بەرەوە بۆ خۆی و پەرداخێکی پڕ کرد و نای بە سەرەوە هەڵی قوڕاند.

((بەباشی ئاگات لە کارتەکانت بێت. مستر بارسادکاتی بۆ راگرە!)).

جاسووسەکە سەیری کارتەکانی خۆی کرد. لە راستیدا کارتێکی بێ هێزی بە دەستەوە بوو. لێرەدا چەند کارتێکی خراپ هەبوون کە سایدنی کارتۆن هەر ئاگای لێنەبوو. بارساد لەئینگلتەرادا لەکار دەرکرابوو لە بەر ئەوەی جاسووسێکی درۆزن و ناموەفەقی پۆلیس بوو. ئەو هەوەڵ هات بۆ فەڕەنسا بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە سەر شۆڕیە لەوێ. ئەم جارەشیان بۆ حکوومەتی فەڕەنسا. لە سەرەتادا ئەو هەر جاسووسێکی هاووڵاتی خۆی بوو لە فەڕەنسا. پاشان بوو بە جاسووسێکی فەرەنسی. بۆیە حکوومەتی پاشایەتی فەڕەنسا وەك جاسووسێکی تایبەت لە شەقامی ئانتۆینەدا دایمەزراند. بەتایبەت بۆ دیفارجەکان.

حکوومەتی پاشایەتی زانیاری تەواوی لە بارەی دکتۆر مانێتەوە دابوو بە بارساد کە بەم بۆنەوە لەگەڵ دیفارجەکاندا دانوستان بکات. ئەو هەوڵیدا کە ئەوە بکات بەڵام هەوڵەکان تێشکا. ئەو بیری کەوتەوە کە لەو کاتەدا کە ئەو قسەی دەکرد ژنەکە خەریکی دروومان بوو چۆن دەلەرزی. ئەو لەو کاتەوە کە هەندێ زانیاری بە دژایەتی هەندێ کەس پێداوە ئەویش ژنەکەی لە نێو لیستەکەیدا هەڵدوورین. بەم زووانە زۆربەیان نێرراون بۆ ژێر گالیۆتینە. دەیزانی کە ئەو جاسووسە هەندێ دوژمنی هەیە و بەساغی دەرناچێ: بۆیە دەیزانی لەم ئاکامەدا گومانی تەواوی لە سەرە و ناتوانێ کۆتایی بەژیانی ئەو پیاوە بهێنێ. لێرەدا هیچ کارێکی بۆ نەمایەوە بەڵکو کارەکەش لە دەست دەرچوو.

سایدنی بە هێمنی وتی: «ئەڵێی کارتەکەی خۆتت خۆش ناوێ؟».

مستر بارساد لای کردەوە بەلای مستر (لۆری)دا. «داوات لێدەکەم بەرگری لێبکە با ئەوەندە نەڵێ. من قەبووڵی دەکەم کە من جاسووسم و ئەم کارەش وەك ئیشێکی سەرشوڕانە وایە. بەڵام دەی خۆ ئەبێ هەر یەکێك بیکات. بە دڵنیاییەوە پیاوچاکێك نایەت وەك جاسووسێکی خوێڕی خۆی ببووژێنێتەوە».

«مستر بارساد. ئێستا ئەتوانم لە یارمەتی کەڵك وەربگرم؟ یان دەبێ بڕۆم بۆنزیکترین کۆمیتەی کۆماری خوازەکان؟». سەعاتەکەی هەڵگرت. «تۆ هەر چەند دەقەیەك ماوەت هەیە بڕیار بدەی».

«بەڵام گەورەم، بە دڵنیاییەوە، ڕێزی تایبەتی ئێوە بۆ خوشکەکەی من کە بەرگری لە ئێوە کردووە لە ...».

«باشترین ڕێگەیەك کە من دەتوانم ڕێزی خۆم بە خوشکەکەی تۆی نیشانبدەم ئەوەیە کە لەدەستی براکەی ڕزگاری بکەم».

«یانێ تۆ وا بیر دەکەیتەوە؟».

«بەڵێ من دڵنیاشم بەوە».

جاسووسەکە بێدەنگ مایەوە. هەموو ورەیەکی بە خۆی ڕۆیی بوو. بە تەواوی کەوتە ناو لالاندنەوە لەوان.

سایدنی وتی: «بەراستی. من وابزانم کارتێکی تریشم ماوە. ئەو پیاوەکەی تر کە تۆ

قسەت لەگەڵ دەکرد لە مەیخانەکەدا، جاسووسێکیتره. وا دەزانم ئەویش دەناسمەوە. کێبوو؟)).

بارساد وەڵامی دایەوە: ((پیاوێکی فەرەنسی بوو. زۆر موهیم نەبوو)).

سایدنی وتی: ((لەوانەیە، من ئێستاش هەر وێنەی دەناسمەوە، فەرەنسی قسەی دەکرد. بەڵام وەك خارجییەك. دڵنیام کە پێشتر دیومە)).

جاسووسەکە وتی: ((شتی وا نییە)).

سایدنی قیراندی بە سەریا و بە دەستی مێزەکەی دایە بەر مشت. ((من دیومەتەوە. کلای! ئێمە ئەو پیاوەمان بەچاوی خۆمان دیت لای بێڵی پیردا)).

جاسووسەکە وتی: ((نە، ئێوە بە هەڵەدا چوون. کلای لەلەندەندا مرد و نێژرا)).

لێرەدا مستر کرانچیر هەستایەسەر پێ و چەند هەنگاوێك بەرەو پێش چوو.

وتی: ((من هەندێ شت لەبارەی ئەوەوە دەزانم. من دەزانم کە ئەو نەنێژراوە ئەو پرسە و سەرخۆشییە راست نەبوو. خۆ هیچ تەرمێك نەنێژرایە ناو گۆڕەکەوە. تابووتەکەی پڕی بوو لە بەرددا. ئەو پرسە درۆینە دروستکرا بۆ ئەوەی هەموو کەس وا بیر بکاتەوە کە ئەو کردووە ئیتر لە بەر چاو ون بووە)).

مستر لۆری وتی: ((جێری. تۆ چۆن ئیشی وات کرد. بڕوا پێکراوێکی تیلسۆنەکان خۆی تێکەڵ بەو کارە خەتەرناکە دەکات. ئەی چۆن تۆ هەستتکرد کە ئەو تابووتە پڕە لە بەرددا؟)).

((ناتوانم پێتان بڵێم گەورەم، لەکۆتاییدا پێت دەڵێم نەك ئێستا. بەڵام خۆ زانیم سەیری رواڵەتی ئەو پیاوانە کە هەر دووکیان دەزانن کە من راستەکەی دەڵێم. ئەبێ هەردووکیان بکوژم)).

لەراستیدا رووی مستر بارساد زەرد بوو دەمیشی وشك بوو سەری سوڕ مابوو.

مستر کارتۆن وتی: ((من شتێك دەبینم. مستر بارساد هاوڕێی پیاوێکە وەك خۆی. کە ئەمەش رازێکە. پیاوێك کە ئەمرێت و دووبارە دێتەوە بۆ ناو دنیا و دەژی. ئەوەش شتێکی دەگمەنە. لەوانەشە من بتوانم, بڵێم، لێرەدا دوو جاسووس هەن کە هەردووکیان لە زیندان دان. هەر دووکیان جاسووسی دەرەوەن هەردووکیان لەزینداندا کاردەکەن. هەر دژ

بە کۆمارن. ئەمەش وا دیارە کارتێکی دیکەش بێت. مستر بارساد کایە دەکەیت؟».

بارساد وتی: «نە، من تەسلیم دەبم من قەبوولڵدەکەم کەخەڵکی لەندن خۆشیان لە کلای نەدەهات خۆشم هەروەها بۆیە باشتر بوو کە هەڵبێین. بە سەختی ڕێگەمان دیتەوە. کلای قەت هەڵنەدەهات ئەگەر ئەو پرسە و سەرخۆشییە درۆینە نەبووایە. بەڵام بۆ من وەك رازێك وایە کە داخۆ ئەو پیاوە چۆن پێی زانیبێت».

جێری وتی: «وازی لێبێنە. من خۆم دەزانم ئیتر بەسە. پرسانەی داهاتوو کە هینی تۆ و کلای دەبێت راستەقینەیە و درۆیی نییە. کە هیوادارم کۆتاییتان پێ بێنێ».

جاسووسەکە لەو گەڕایەوە لای کرد بەلای سایدنی کارتۆنەوە.

«تۆ چیت لە من دەوێ بۆت ئەنجامبدەم؟ خێرا دەچمەوە بۆ سەر کارەکەم هێشتا درەنگ نەبوو ـ وەبیریش بهێنێتەوە. تۆ نابێ زۆر پرسیارم لێبکەیت. ئەگەر داوام لێبکەیت لەم مەترسییە گەورەیەدا سەرم تیا بەم، بەرگری دەکەم مەجبوورم لەدژایەتی تۆدا زانیاری بدرکێنم. ئەو جار لەوانەیە زۆر خەتەرناك بێت بۆ من کە موافق بم تاکو بە درۆی بخەمەوە. هەمووومان لەمەترسیداین. ئەی تۆ چیت دەوێ؟».

زۆرمان ناوێت تۆ لە حەماڵخانەدا کاردەکەی دەتوانی بڕۆیتە ژوورەوە؟».

«پێتدەڵێم لەوێ هەڵهاتن نامومکینە».

«چۆن باسی هەڵهاتن دەکەی؟ تۆ لە حەماڵخانە ئیش دەکەی؟».

«من هەندێ کاریش دەکەم».

«هەر کاتێك کە هەڵبژێرایت دەچیتە ئەوێ؟».

«کە هەڵبژێرام هەر دەتوانم بچمە ژووەوە بێمە دەرەوە».

کارتۆن جامێکیتری پڕ لە شەراب کرد، لەخواردنەوەیدا رای خۆی گوڕی. بە سانایی رشتییە سەر ناوتەختی فەرشەکە.

«ئێستاش مستر بارساد وەرە لەگەڵمدا بچینە هۆدەی تر و ڕێگە بدە با ئاخرین قسەمان بکەین».

# - ٢١ -

# سایدنی کارتۆن پیلانەکەی خۆی دەگێڕێ

کاتێك بارساد و کارتۆن پێکەوە چوونە ناو هۆدەکەوە. مستر لۆری بە گومان و بێ بڕۆاییەوە سەیری جێری کرد.

وتی: ((جێری، وەرە بۆ ئێرە)).

مستر کرانچیڕ هاتە پێشترەوە کە لە پێش هاوشانەکەیەوە بوو.

((چیت دەکرد لە پاڵ ئەو پەیامنێرەدا؟ وا گومان دەکەم جێری، تۆ لە بەنکە گەورەکەی تیلسۆنەکان کەڵکت وەرگرتووە بۆ داپۆشینی کارە نایاساییەکانت. ئەگەر کردووتە من لەو نهێنییە جیا مەکەرەوە)).

جێری وتی: ((گەورەم هیوادارم تۆ قەت ئازاری گیانی هەژارێکی وەك من نەدەیت. دکتۆرەکان پێویستیان بە تەرم هەیە هەر بۆ موتالەعەی خۆیان. هەندێکیش ئەبێ وەرگرن)).

مستر لۆری هاواری کرد: ((ئاه، من لە نیگای تۆ دەلەرزم)).

((گەورەم، ئەوەندە لەمن گرژ مەبە. پێویستیم بەوە نەبووە پێتبڵێم باشتر وایە لای خۆم بێت. تەنها بە بۆنەیەکی باشەوە پێموتوویت)).

مستر لۆری وتی: ((راستە، زیاتر قسە مەکە من ئێستاش هەر دۆستی تۆم ئەگەر لەداهاتووشدا باشتریش بیت)).

لەو کاتەدا سایدنی کارتۆن و جاسووسەکە گەڕانەوە.

پێشوونەکە وتی: ((خوات لەگەڵ مستر بارساد. کارەکانمان دروستکراون تۆش نایەوێت ئیتر لە من بترسی)).

هەر ئەوەندە کە بارساد رۆیشت مستر لۆری پرسیاریکرد کارتۆن چی کردووە.

((زۆر نە بەڵام وام دارِشتووە هەر کاتێك پێویست بێ چاومان بە دارِنی

دەکەوێت لەزینداندا)).

مستر لۆری وتی: ((ئەی بە تەنها یارمەتییان نادات)).

((قەت ئەو پرسیارەم نەکرد کە بتوانیت)).

مستر لۆری لە پاڵ زۆپاکەدا دانیشت. ئەو لەو کاتەدا پیرەپیاوێك بوو. لە ناخەوە پڕ لە هاودەردی لەگەڵ لویس لەلایەکی دیکەشەوە پەریشانە بۆ هاوسەرەکەی. بۆیە ئەشکی دەهاتە خوارەوە.

کارتۆن: ((بە لویسی وت دەربارەی ئەو پڕۆژەوە هیچ مەڵێ، لەوانەیە هەزاران هۆ و خەیاڵی لێبدات و هەرکام لەوانەش ببن بە کێشەیەکی نوێ. پێموایە هەر چاوم پێی نەکەوێ باشترە. من هەر کارێك لە دەستم بێت دەیکەم. بێ ئەو شتەش هیوادارم تۆ بەم زوانە چاوت پێبکەوێت. لەوانەیە ئەمشەو زۆر دڵنارەحەت بێت)).

((هەر ئێستا دەچم)).

((زۆر پێخۆشحاڵم لەوەی کە تا ئەو رادەیە پێوەندی بەتۆوە هەیە. ئەو روانگەی چۆنە؟)).

((ئەو پەرۆشە و دڵیشی زۆر نارەحەتە، بەڵام زۆر جوانیشە)).

کارتۆن هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و وتی: ((ئاە!)). پاشان درێژەی دایەوە: ((گەورەم، ئەرکەکانی تۆش لێرەدا کۆتایی پێ هاتووە؟)).

((بەڵێ، ئەوەی کە لێرەدا پێم بکرێت ئەنجامداوە. هیوادارم ئەوانی دیکەش بە سەلامەتی تەواو بە جێ بێڵم. بەڵێنیشم وەرگرتووە بۆ رۆیشتن. من ئامادەبووم بۆ رۆیشتن)).

هەردووکیان بێدەنگ بوون.

کارتۆن وتی:)) گەورەم، تۆ تەمەنێکی درێژت پێویستە پێدا بچیتەوە)).

((من ئێستا هام لە حەفتا و هەشتەمین ساڵی ژیانمدا)).

((ئایا بە درێژایی تەمەنت بەکەڵك بوویت. جێی بڕوا و متمانە و رێز بوویت؟)).

((هەر لەوکاتەوە کە بووم بە کوڕ هەر سەر قاڵ بووم. بەڵام هەر ژنم نەهێناوە وئێستاش هەر وا تەنهام. کەسیش بۆم ناگری)).

((ئەی لویس بۆت ناگری؟ لەگەڵ کچەکەیدا)).

((بەڵێ، بەڵێ، سوپاس بۆخوا. لەوێ کەوتم مەبەستێکم نەبوو)).

((کە تۆ ڕێز و خۆشەویستی و دڵی کەسانی دیکەت بە دەست نەهێناوە لەژیانتا، کە تۆ شتێکی باشت نەکردبێت بەو بۆنەوە یادتبکەنەوە، حەفتا و هەشت ساڵ تەمەنی ژیانت ئەبێ بە حەفتا و هەشت جار تف و لەعنەت، وا نییە؟)).

مستر لۆری وتی: ((بەڵێ پێموایە)).

کارتۆن هەستایە سەرپێ و ئاخافتنەکەی کوتایی پێهێنا و یارمەتی مستر لۆری دا کۆتەکەی بکاتە بەری.

((مستر لۆری، لەگەڵت دێم تا دەم دەروازەکە. سبەینێ لە دادگاکەدا دەتبینمەوە. شانم بگرە گەورەم)).

لە پلیکانەوە هاتنە خوارەوە. هاتنە سەر شەقامەکە. کاتێك گەیشتنە دەرگای ماڵی لویس، مستر لۆری ڕۆیشتە ژوورەوە. کارتۆن کەمێ وەستا و گەڕایەوە دەرگاکەی راگرت.

وتی: ((هاتۆتە دەرەوە لێرە. وەك هەموو ڕۆژێك ڕۆیشتووە بۆ زیندانەکە، پێی ناوەتە سەر ئەو بەردانە. با بە دوای جێ پێکانیا بڕۆم)).

کاتژمێر دەی شەو بوو کە لە بەر زیندانی لا-فۆرسدا راوەستابوو. لە ژێر چرا لامپایەکی راوەستابوو بۆ خۆی بە قەڵەمێکی دارینە بە سەر لەتێ کاغەزەوە خەریکی نووسین بوو. پاشان بە نێو شەقامێکی تاریك و قوڕ و چڵپاودا دەڕۆیشت. لە بەر دووکانێکدا راوەستا کە دەوا و دەرمانی تێدا دەفرۆشرا. کاغەزەکەی نایە بەردەم دوکاندارەکەوە.

پیاوەکە لەکاتێکدا کە پاکەتێکی بچکۆلەی هەڵدەگرت وتی: ((هاوشاری، ئاگات لێی بێت. تەئسیراتەکەی دەزانی؟)).

((بە تەواوی)).

بە وریاییەوە خستییە نێو گیرفانیەوە و دوکانەکەی جێهێشت.

شەوگاری ئەو شەوە بە نێو شەقامەکانی ئەو شارەدا وێڵ و وەیلان بوو. بەڵام کە

خۆر هەڵهات، خەو دایگرت بە سەر دیوارەکەی چەمی (سەین)ەوە خەوی لێکەوت. کاتێك خەبەری بووەوە ماوەیەکی کورت سەیری ئاوەکەی کرد و پاشان کەوتە ڕێ بەرەو هۆدەکەی مستر لۆری، بەڵام خۆ ئەو پیاوە پیرەی پیاو باشە بە نیازی دادگاوە ئەوی جێ هێشتبوو. کارتۆن تۆزێ قاوەی سەردا و چەن تیکەیەك نانی قووتدا و سووکە حەمامێکی بۆ کرد و جلەکانی گۆڕی و بەرەو شوێنی دادگاییەکە کەوتە ڕێ. دکتۆر مانێت لەوێ بوو، مستر لۆری لەوێ بوو. لویس لەوێ بوو لە پاڵ باوکیدا دانیشتبوو.

کاتێك کە مێردەکەیان هێنایە ژوورەوە وەك ورەی پێبدات چاوێکی لێ داگرت کە پڕ بوو لە خۆشەویستی و تامەزرۆیی. بۆیە ئەویش (مێردەکەی) بەم شێوە خوێن گەڕایەوە بۆ ڕواڵەتی و گەش بووەوە و بەرچاویشی ڕووناك بووەوە. پێش ئەو دادگاییە نایاساییە، چەند دەستوورێکی کورتی تێدا وترا و کەسێکی تاوانبار نەبوو دڵنیا بێت کە ئەو دادگاییە هۆیەکی هەیە. ئاشکرا بوو کە لە نیگای گرژی هەر پێنج قازییەکە، هەروەها هەیئەتی قازییەکان دەردەکەوێت کە هیچ نیاز پاکییەك ئەمڕۆ لەوان ڕوو نادات.

خاڵی سەرەکی کێشەکە بۆ دادگا خوێنرایەوە.

((چارلز ئیڤرمۆند، ناسراو بەدارنی، دوێنێ بەرەڵا کراوە. هەر دوێنێ دووبارە تاوانبار کراوە و هێنراوەتەوە. بە دژ بەکۆماری تاوانبارە لە بنەماڵەی نەجیب زادەکانە (واتە ئەشرافیان) کە تاوانبارن بە تۆقاندن و داپڵۆسینی خەڵك)).

سەرۆکی دادگا پرسیاریکرد: ((ئایا بە راشکاوی تاوانبارکراوە یان بەنهێنی؟)).

((مانسیۆری سەرۆك بە راشکاوی)).

((لە لایەن کێوە؟)).

((لە لایەن ئەم سێ کەسەوە: ئیرنیست دیفارج، ترێسا دیفارج ژنەکەی و ئەلکساندەر مانێت دکتۆر)).

لە ناو دادگاکەوە هاوارێ بەرز بووەوە. لەناوەڕاستی دادگاکەوە دکتۆر مانێت دەبینرایەوە، ڕەنگی زەرد ببوو و شەق شەق دەلەرزی، لەوێ کەدانیشتبوو هەستایە سەرپێ.

((سەرۆکی دادگای بەڕێز، رادەگەیەنم کە ئەمە فێڵ و تەڵەکەیە. تۆش دەزانی کە

ئەو گومانلێکراوە هاوسەری کچەکەی منە. کێیە کە دەڵێ من مێردی کچەکەم تاوانبار دەکەم؟)).

((هاوشاری مانێت، لە سەرخۆبە گوێراگرە بۆ ئەوەی لەدواییدا دەڵێین. لە هەمانکاتیشدا بێدەنگ بە)).

هەر کە دکتۆر دانیشت هەرا و هۆریایەکی خۆشی کرا، کە لێوە لەرزێ پێ کەوتبوو.

لەکاتێکدا دووبارە دادگاکە هێور بووەوە، دیفارج هەستایە سەر پێ و داستانی چۆنیەتی زیندانییەکەی مانێت و ئەو کاتەی کە ئازاد بوو گەیشتنە لای ئەو هەڵیدایەوە.

((هاوشاری دیفارج، تۆ لە گرتنەوەی زیندانی باستیلدا خزمەتی باشت کرد؟)).

((وای بۆ دەچم)).

((هاوشاری، ئەوەی کە لەو رۆژانەدا دەتکرد پێمانبڵێ)).

دیفارج سەیری ژنەکەی دەکرد وتی: ((من دەزانم، دەزانم کە ئەم زیندانییە لە هۆدەیەکی بە ناوی سەدو و پێنج، بورجی شیمالی راگیرابوو. من ئەوە لە خۆی فێر بووم. ئەو خۆی جگە بەو ناوە سەد و پێنج بورجی شیمالی نەدەناسییەوە. کاتێك زیندانی باستیل تێکشکێندرا. بۆ خۆم چوومە ناو هۆدە تەنیا کەسێکەوە، کە بە رێنوێنی نگابانێك رۆیشتم. هۆدەکەم بە تاقەت تاقیکردەوە و جوان گەڕام. لە کونی لوولە زۆپایەکدا نامەیەکی نووسراوم دۆزیەوە. ئەمەش ئەو نوسراوەیە کە دەست نووسی دکتۆر مانێتە. کە ئەو نووسراوەیە دەهێنمە بەردەم سەرۆکی دادگاوە)).

((جارێ با بیخوێنیتەوە!)).

لە بێدەنگییەکی تەواودا نامەکە بەم شێوەی خوارەوە خوێندرایەوە.

## - ٢٢ -

# بەسەرهاتی دکتۆر

من، ئەلکساندەر مانێت. لە ساڵی ١٧٦٧ دا لەزیندانی باستیل ئەمـە دەنووسـم. نیازیـشم ئەوەیە کە نووسراوەکەم لە کونێکی لوولە زۆپاکەدا بشارمەوە بۆیە لەوانەیە پاش مەرگم کەسێك ئەو نووسراوەیە بدۆزێتەوە. ئێستا ئەحواڵم باشە. من شێت نیم (چونکە دەترسم لەوانەیـە خێـرا خۆم ون کەم) یان باوەڕ بە خۆم نەکەم. ئەوەی کە دەینووسم راستە، ئەمە بەنانوخی ژەنگاوییـەوە کە لە بریتی قەڵەم بە کارم هێناوە و خوێنی خۆشم تێکەڵ بە دۆرژەنگی زۆپاکە کردووە لەبـریتی مەرکەب بەکارم هێناوە.

لە ساڵی ١٧٥٧ دا لە شەوێکی مانگەشەوی تێکـەڵ بـە هـەور لـەکـەناری روبـاری سـایندا پیاسەم دەکرد. گاریيەك دوا بە دوای من هات. کە لێم نزیـك بـووەوە لـە دەلاقـەی گاریيەکـەوە پیاوێ ملی کێشایە دەرەوە. دەستووریدا گاریيەکە رادەوەستێت. بە نـاوی خۆمــەوە بـانگیکردم. دوو پیاوی رەنگ ماقووڵ دەرپەڕین. هەر ئەوەندە تێگەیشتم کە هـەردووکیان لـە یـەك دەچـوون باڵاشیان بە قەد یەك بوون. هەڵس و کەوت و دەنگ و رەنگیان وەك یەك بوو.

یەکێکیان وتی: ((تۆیت دکتۆر مانێت؟)).

وەڵامم دایەوە: ((بەڵێ ئاغا خۆمم)).

وتیان: ((ئێمە لە ماڵتان بووین. وتمان داخـوا لـەکـوێ دەتـوانین تـۆ بدۆزینـەوە. تکایـە وەرە سواری گاريیەکە بە)).

منیش وەڵامم دایەوە: ((من وەك رەواڵی خۆم دەربـارەی شـێوەی سروشـتی بانگکردنەکـەی خۆم دەپرسم. هەروەها ناوی ئەو کەسەی کە پێویستی بە یارمەتی من هەیە)).

وتیان: ((ئێمە لە بنەماڵەیەکی باشین و دەربارەی شێوەی سروشتی بانگکردنەکەش بۆخۆت. دەیبینیت)). هەر یەکە و لەلایەکەوە وەستابوون منیش بە گوێم کردن.

گاریيەکـە لـە دەرگـای بـاکوورەوە رۆیـشتە دەرەوە، دەورەی دوو مایلێـك بـەولاترەوە رێگـە ئەسڵییەکەی بەجێهێشت تا گەیشتە تەنیا ماڵێـك. گـوێم لـەدەنگـی هـاوار و گریانێـك بـوو لـە

هۆدەی سەرەوە بوو. منیش برام بۆ ئەوێ. ئافرەتێکی جوانی لێبوو کە گەرمایەکی زۆر جەستەی داگرتبوو. لە بینینی ئەودا سەرم سوڕما و گێژم خوارد. زۆر جوان و دڵڕفێن و بە تەمەنیش لاو بوو. قژی قرتابوو، بە پەڕۆیەکی پەشمینە هەر دوو باڵیان بە جەستەیەوە جەڕاندبوو. بە سووچێکی کراسەکەیەوە پیتی ((E)) نوسرابوو. چاوەکانی وەك چاوی هەر دیلەیی لێ هاتبوو و کۆتایی بە گریانەکەی هێنا. ((هاوسەرەکەم رۆ، باوکم رۆ، براکەم!)). دیسان دەستیکرد بە ژمارە ((یەك دوو و سێ و هتد...)). تا زیاتر لەدوانزدە. پاشان وا دیار بوو گوێ دەگرێ. لەدواییدا دیسان دەستی پێکردەوە و زیاتر و زیاتر دەی ژمارد.

پرسیارم کرد: ((لە کەیەوە. ئاوای بە سەر هاتووە؟)).

برا گەورکەی وتی: ((لە دوێنێ شەو لەم کاتانەوە)).

هەندێ دەوا و دەرمانم دا بە کچەکە بۆ ئەوەی کە بینێمە سەرجێ بۆ خەوتن و لە پاڵیا دانیشم بۆ چاودێری تەئسیری دەرمانەکەم. پاش نزیکەی نیو سەعاتێك هێورتر بووەوە. پاشان برا گەورەکەی وتی: ((یەکێکی تریش هەیە)). چراوکێکی هەڵگرت و رێنوێنی کردم بۆ هۆدەکەی تر کە شوێنی داری سووتەمەنی و ئالف و شتیتر بوو. تۆزێ لە خوارتر چەند ئەسپێکی لێبوو.

کوڕێکی لە تەمەنی هەڤدەساڵیدا لەوێ بە سەر زەویەکەوە راکێشرابوو. دەستی راستی بە سەر مەمکیدا داکەوتبوو. چاوی دەرتۆقی بوو، یەکەمجار کە دیم وامزانی خەریکە دەمرێ. کاتێك کە رێگەی پێدام دەستی لا بدەم دیتم برینەکەی جێگەی شمشێرەکە نزیکەی بیست و چوار سەعات لەوە پێش لێدراوە.

پرسیم: ((چۆن ئەمە لێت روویداوە؟)).

هیچ مەخابن و پەشێوییەك لەدەنگیدا نەبوو: ((ئەو هەر ئێستاش تاکە مێرلاوی ئاواییە. جەختی کرد لە براکەم، شمشێری بۆ بکێشێ)).

چاوی تەرمەکە گەڕا بە لای مندا. پرسیاریکرد: ((دکتۆر . ئەو کچە... ئەوت چاو پێکەوتووە؟)).

((بەڵێ چاوم پێ کەوت)).

((ئەوە خوشکەکەی منە کە حەزی لە پیاوێکی گەنجی ئاوایی دەکرد. لەو کاتەدا پیاوەکە نەخۆش بوو کە خوشکەکەی من شووی پێکرد. ئەبوا ئەو هەر ئاگای لەو بووایە و بە لایەوە

بووایه. پاشان برا جوانترەکەی ئەوی دیتبوو - بۆیە حەزی لێکردبوو. پیاوەکەیان هاندەدا بەشەوگاران کار بکات بەیانیش تا ئێوارە هەر عارەبانەیان پێ دەکێشا. ڕۆژێکیان سەر لەنیوەڕۆ کاتێك کە سەعات زەنگی دوانزدەی لێدەدا لەگەڵ هەر چرکەیەکدا هاوار هاوارێکی دەکرد پاشان مرد. ئەوانیش کچەکەیان هەڵگرت. کاتێکیش کە باوکم لەم کارەساتە ئاگادار بوو، مەراقی کرد و مرد. منیش خوشکە بچکۆلەکەم هەڵگرت و بەرەو شوێنێکی هێمنتر بردم. پاشان کەوتمەدوای براکەی بۆ ئێرە. دوێنێ شەو هەڵزنام بە ماڵەکەدا و شمشێرێکیشم بە دەستەوە بوو. ژنەکە گوێی لەمن بوو رایکردە ژوورەوە. لە دواییدا پیاوەکە هات من شمشێرەکەم دەرهێنا ئەویش لە بەر گیانی خۆی دەستی دایە شمشێرەکەی ئەمەش ئاکامەکەیەتی. دکتۆر گیان هەڵمگرە بمبە سەرەوە. ئەو ها لە کوێ؟)).

منیش بەرزمکردەوە، لەپڕ ئەو هێز و توانایەی کە تێدا مابوو کردی لە خۆی و هەستایە سەر پێ.

وتی: ((مارکۆس، چارتەکەم، ئەبێ بە حەسابی تۆ وێنەکانتا بگەم هەتا دوا کەسی خێڵەکەت بۆ ئەوەی ئەبێ تاوانی ئەو کارانە بدەی. ئەوا خەتی خوێنیت بۆ ئەکێشم. هەر وەها هەڕەشە دەبەمە سەر برا کەشت. چارەڕەشی خێڵە بەد ناوەکەت کە ئەبێ سزا بدرێت. وەك نیشانەیەك ئەوا خەتی خوێنینت بۆ دەکێشم)).

بۆ جاری دووهەم دەستی خستەوە ناو برینەکەی سەرسگنی و بەئاسمانەوە سەلیبێکی کێشا. پاشان دەستی داکەوت. هەر ئەوەندە کە رامکێشایەوە هەستمکرد مردووە.

گەڕامەوە بۆ لای کچە جوانەکە. ئەو هەر دەیناڵاند. خۆشم دەمزانی ئەوا چەند سەعات تێپەڕی کردووە یەکێکیش مردووە.

برا گەورەکە هات و لەنزیك من دانیشت.

وتی: ((دکتۆر، تۆ پیاوێکی گەنجی لە سەرتە داهاتووی خۆت دروستبکەیت. باشتر ئەوەیە ئەوانەی کە لێرەدا دیت و گوێت لێبوو لایکەس باسینەکەیت)).

من وەڵامم نەدایەوە.

دوو سەعات پاش ئەوە کچەکە گیانی دەرچوو. هەر دوو براکەی لە خوار پلیکانەکانەوە دانیشتبوون. براگەورەکەی کیفێکی پڕ لە ئاڵتونی لە باخەڵیا دەرکێشا و هێنای بۆ من.

وتم: ((تکایە بمبوورن دەربارەی چۆنیەتی رووداوەکەیە؟ نە، وەری ناگرم)).

سەیری یەکتریان کرد. پشتم تێکردن و بێ هیچ قسەیەکی‌تر لەیەك جیا بوونەوە.

سەر لە بەیانی ڕۆژی دواتر کیفێکی پڕ لە ئاڵتون لەماڵەکەی مندا دانرابوو. منیش بۆ خۆم بڕیارمدا لەم پەیوەندییەوە بۆ وەزیر نامەیەك بنووسم. هەر لەم سەر و بەندەدا پێموترا کە ئافرەتێکی گەنج دەیەوێ چاوی بە من بکەوێت. هەر لەو ڕێگەوە ئەو ئافرەتە پەردەی لە سەر ڕووداوەکە هەڵماڵی مێردەکەی ئەو کوڕە گەنجترەکەیان بوو، بەڵام ئەو حەزی بەو هاوسەریە نەکردبوو. ئەو نەیدەزانی کە کچەکە مردووە بەڵام هیوادار بوو بە شێوەیەکی شاراوە لەو ڕێگەوە بڕوات بە هانایەوە. ئەو خوشکە بچکۆلەی کچە مردووەکەی دەزانی و هەروەها بە هێواش بوو بڕوات بە هانایەوە. من بۆ هەمووی پێموت دەزانم وتیشم من ئەمزانی خوشکە بچکۆلەکە لەکوێیە. کاتێك کە لەگەڵی چووم تا دەم دەرگاکە لەناو گارییەکەدا کوڕێکی سێ ساڵانم دیت.

ئافرەتەکە وتی: ((لە بەر ڕۆلەکەم، ئەمەوێ هەر شتێکی کە لە دەستمدێت بۆ ئەو بنەماڵە زاڵمە بیکەم. ئەگەر نەیکەم دەبێتە تف و نەعلەت لە من. خۆم هەستدەکەم لەوانەیە ڕۆژێك جەخت لە من بکات بۆ ئەوەی تاوانی ئەو غەڵەتانەم لێبگرێت کە ئەگەر نەیکەم. من هەندێ زێڕ و زێوەرم هەیە. ئەبێ لە سەرەمەرگیشمدا پێیبڵێم بیدات بەو بنەماڵەیەی کە ئەو باوکیانە تووشی غەڵەت بوو)).

منداڵەکەی ماچکرد و وتی:)) چارلزی بچکۆلە، تۆش شەڕاشۆ دەبیت؟)).

منداڵەکەش بە لە خۆبردووییەوە وەڵامی دایەوە: ((بەڵێ)).

ئەو ئاماژەی بۆ ناوی مێردەکەی کرد. وای دەزانی من ئەیناسم. بەڵام من لەنامەکەدا هیچ گۆڕانێکم نەکرد. هەر ئەو ڕۆژە خۆم مۆر و ئیمزام کرد وخۆیشم ناردم.

هەر ئەو شەوە، پیاوێك بە جلی ڕەش خۆی داپێچابوو. پەنجەی نا بە زەنگەکەدا و داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ من کرد. کارەکەرە گەنجەکەم کەناوی ئێرنێست دیفارج بوو دەرگاکەی بۆکردەوە. ئەویش کەوتە دوای دیفارج هاتە سەرەوە بۆلای من کە لەگەڵ ژنە خۆشەویستەکەمدا دانیشتبووم.

پیاوەکە وتی: ((لە شەقامی ریۆ — هۆنۆرە کارەساتێکی بە پەلە هەیە. گارییەکەم پێیە لە دەرەوە چاوەڕوانە)).

هەر ئەوەندە هاتمە دەرەوە توورەکەیەکی ڕەشیان کرد بە سەرما چاویان بە پەڕۆیەکی ڕەشدا پێچام. هەر دوو دەستیان بەستم. هەر دوو براکە لە تاریکایی شەقامەکەوە ڕۆیشتنە ئەو بەرەوە.

برا گەورەکە (مارکۆس) دەستیکرد بە گیرفانیدا و ئەو نامەی کە من بۆ وەزیرم نوسیبوو دەریهێنا و بە گڕی چراوکی گارییەکە ئاگری دا و سووتووەکەشی هاوێشتە ناو ئەو قوڕ و چلپاوە. هیچ قسەیەك نەکرا. پاشان گارییەکە منی هێنا بۆ ئەم زیندانە، کە بووە بە گۆڕی من.

لە هەموو ئەم سالآنەدا ئەم پیاوانە منیان لە هەموو هەواڵێکی بنەماڵەکەم و ژنەکەیشم بێ بەری کردووە. نازانم ئایا ئەو (ژنەکەم) ماوە یان مردووە. هیچ رەحم و بەزەیی لە دڵیاندا نییە. خوایش بەزەیی ناخاتەدڵیانەوە. مۆرکی خاکی سووریش (سەلیب) هەر لەعنەتیان دەکات.

منیش ئەلکساندەر مانێت، بەر لەعنەتی ئەو دووبرا کەوتووم و لە ناو ئاخرین خراپەکارییەکانی دروستکراوی دەستی ئەو کێبەرکێیە شەیتانیانەی ئەوان نوقم بووم.

کاتێك کە خوێندنەوەی ئەو نامەیە تەواو بوو دەنگێکی لەرزۆك لەناو خەڵکەکەدا بەرز بووەوە.. — هاوارێ بۆ خوێن.

پێویستی بەوە نەدەکرد کە ئێستا جێی سەرسوڕمان بێت کە بۆچی تا ئێستاش ئەو بەڵگەنامەیە لای دیفارجەکانەوە هەر وەك نهێنییەك ماوەتەوە. ئەو بەڵگەنامەیان هەڵگرت بۆئەو کاتەی کە گەورەترین تەئسیری هەبوو. لێرەدا ئیتر پێویست بەوە ناکات جێی سەرسوڕمان بێت کە بۆچی بنەماڵەی ئیڤرمۆند لە لایەن خەڵکی شەقامی ئانتۆینەوە لەعنەت دەکرێن و خەڵك ئەوەندە رق و بێزاری خۆیان بەو بنەماڵەیە دەڕێژن.

خاتوو دیفارج کە لە بەر خۆیەوە برتە و بۆڵەی دەکرد لە پاڵ ژنێکی دیکەدا بەناوی ((ڤینگێنس)) دانیشتبوو وتی: ((دکتۆر کە ئەوەندە بە دەوری ئەودا (دارنی) ئەپاڵێوێ، هەر لە ئەوانە، وایە؟ بەرەڵای کە دکتۆر، دەی ئەگەر ئەتوانی بەرەڵای کە)).

هەر کام لە هەیئەتی مونسیفەکان قرمەیان ئەهات رایان تووڕەیی بوو، ئەم و ئەو هەر هەمووی هەر قرمە و تووڕەیی بوو.

هەموو بڕیاریاندا! ئیڤرمۆند، ناسراو بەدارنی. ئەبێ بگەڕێتەوە بۆ زیندان و لە ماوەی بیست و چوار سەعاتاندا بکوژرێت.

## - ٢٣ -

# مستر لۆری بەڵێنێك دەدات

لویس هەر دوو باڵی کردەوە بۆ مێردەکەی.

((بیەڵن با یەك جار لێی کەوم! ڕێ بدەن با ماچێکی کەم! ئۆف، هاوشاریانی باش دڵتان بۆمان بسووتێ!)).

زۆربەی ئەو ((هاوشارییە باشانە)) ڕۆیشتنە دەرەوە بەرامبەر بە زیندانییەکە پێیان نا بەدڵی خۆیاندا. لەناو ئەواندا یەکێك دیار بوو کە ژووری دادگاییەکەی بەجێهێشت، بارساد بوو.

وتی(جان بارساد): ((ڕێگەی بدەن با مێردەکەی ماچبکات. بۆ چرکەیەکیش بێت)).

ئەوان بەبێدەنگ هێشتیان. ژنەکەیش ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەی چارلزی لێ وەستابوو. باوکی کەوتە دوای کچەکەی و بەرامبەر بە ئەوان چۆکی دادا. بەڵام چارلز گرتی و نەیهێشت چۆك دابدات و هاوارێکی کرد بە گریانەوە:

((نە، نە! بۆ ئێوە چیتان کردووە کە ئێستا ئەبێ بەرامبەر بە ئێمە چۆك دادەن؟ ئێمە ئێستا دەزانین و تێگەشتووین کەئێوە لە غەم و کێشەی ئێمەدا هاوبەشن و هەستتان کردووە کە ئێمە کێین. ئێمە دەزانین ئێوە چۆن بە سەر هەستی خۆتاندا زاڵبوون و لە بەر خاتری ئەو خۆشەویستییە، ئێمە لەقووڵایی دڵەوە سوپاسی هەستتان دەکەین. هەر شاد و خۆش بن!)).

لەو کاتەدا کە دەیان برد، ژنەکەی هەر وەستابوو بەدوایدا دەیڕوانی، بەدەستی گرێدراو بە یەکەوە و نگای پڕ لە خۆشەویستی بوو کە لە بەر چاو ون بوون هەڵگەڕایەوە کەوتەسەر خاك و پێی باوکی. پاشان، سایدنی کارتۆن گرتییە باوەش و لەو شوێنە تاریك و نوتەکەوە کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد هەڵیگرت و بردی بۆناو گارییەکە. کاتێك کەگەیشتنە ماڵەوە بردی بۆ ئەو هۆدەیەی کە کچەکەی و خاتوو پرووس لەوێ بۆ خۆیان هەر دەگریان.

کارتۆن وتی: ((پێش ئەوەی کە بڕۆم، ئەتوانم ماچی بکەم؟. دانەوی و ڕوومەتی گرت و

دەم و چاوی ماچکرد، پاشان دوا بە دوای مستر لۆری و دکتۆر رۆیشت)).

کارتۆن وتی: ((دکتۆر مانێت، تۆدوێنێ نفوزی زۆرت هەبوو. تـۆ ئـەبێ ئـەوەی کـە پێت دەکرێت لە بەینی ئەمڕۆ تا بەیانی پاش نیوەڕۆ ئەنجامی بدەیت بۆبەرەڵاکردنی ئەو)).

((بڕیارمداوە و نیازیشم وایە تەنها ساتێك ئارامم نییە)).

((باشە، هیوایەکی بچکۆلە هەیە کە ئەویش گومان ناکرێت، بەڵام من ئـەبێ بـزانم چـۆن دەکەیت. ئەبێ بیبینی کە چۆن ئەو توانابیەت بە کار دێت؟)).

((یەك تا دوو سەعات)).

((ئەگەر من لە سەعات نۆدا بڕوم بۆ لای مستر لۆری، ئەتوانم ئاگـادار بم لـەوەی کـە تـۆ ئەنجامتداوە؟)).

((بەڵێ)).

((سەرکەوتوو بیت!)).

مستر لۆری کەوتەدوای کارتۆن هەتا دەرگای دەرەوە، هەردوو شـانی سـایدنی گـرت وەك ئەوەی کە بیەوێت بڕوات و ئەو بەرگریبکات.

بە دەنگێکی مەلوولەوە وتی: ((من هیوام بڕیوە)).

((بەڵام من وانیم)).

((پاش ئەوەی کە خـەڵك هەسـتی خۆیـان دەربـڕ کـرد کـەس ناتوانـێ لـەوان خـۆی جیـا کاتەوە)).

کارتۆن لەکاتێکدا هـەنگاوی بـەرەو خـوار دەنـا وەڵامیدایـەوە: ((بـەڵێ، ئـەو دەمرێـت، هیوایەکی راستەقینەی تێدا نییە)).

لەنێو شەقامەکەدا منجەیەکی کرد، بەتەواوی بڕیـاری نـەدابوو بـۆ کـوێ بـچێ. ((ئـەبێ ئەوەی چاکە بیکەم)). بیری کردەوە ((بـۆ ئـەوەی خـۆم نیـشانبدەم، ئـەبێ بـەخـەڵك بـسەلمێنم کەپیـاوێکی وەك مـن لێـرەدا هەیـە. لەوانەیـە ئەمـە ئـەنجامێکی زۆر زەرووری بێـت)). لای کردەوە بەلای شەقامی ئانتۆینەوە.

نانی ئێوارەی خوارد و ئەمەش یەکەمین جار بوو لـەژیانیـدا کـە شـەڕابی زۆری لەگەڵدا نەخواردبێت. پاشـان رۆیـشت بـۆ شەڕابفرۆشـییەکەی دیفارجـەکان. خـۆی کـرد بـە ژووردا و

جێگەیەکی بۆ خوی گرت پاش ئـەوە داوای هەنـدێ شـەڕابی کـرد. (بـە زاراوەی سـەر و پـێ شکاوی فەڕەنسی). مادام دیفارج هەروا بەبێ مەیلی سەرنجێکی دا، پاشان نیگاکـەی تیـژ و تیژتر بووەوە.

مادام دیفارج خـۆی وردە وردە لـە کـارتۆن نزیکبـووەوە و پرسـیاریکرد کـە داوای چـیتر دەکات. هەر ئەوەی کەپێشتر داوای کردبوو دووپاتی کردەوە.

مادام پرسیاری کرد: ((ئینگلتەراییت؟)).

((بەڵێ، مادام، من ئینگلتەراییم)).

مادام ئەوی بەجێهێشت کەشەڕابی بۆ بێنێت و لەوێشەوە مێردەکەی ئاگادار کات.

((سوێندت بۆ دەخۆم هەروەك ئیڤرمۆند وایە و لە خۆی دەچێت)).

جاکیۆسی سێیەم کە لەوێ راوەستابوو، وتی: ((ئیڤرمۆند زۆر لەمێشکتدا جێی گرتووە)).

کە سەیری کارتۆنیان دەکرد بێدەنگییـەك دایگـرتن. کـە سـەرگەرم بـوو بـەخوێندنـەوەی وەرەقەیەکەوە کە بەسەختی بۆی دەخوێندرایەوە و بەنووکی پەنجە وشەکانی دەژمارد.

جاکیۆسـی سـێیەم وتـی: ((ئـەوەی کـە مـادام وتـی راسـتە. بۆچـی لـە سـەر ئیڤرمۆنـد بوەستین؟)).

دیفارج وتی: ((لەوانەیە کەسێك لە شوێنی وەستابێ)).

مادام وتی: ((من ئەبێ هەر لە سەری بڕۆم ئەگەر هەمووشیان مردوو بن)).

دیفارج وتی: ((رایەکی باشە، بەڵام دکتۆر زۆرتر رەنجدەکێشێ. تۆ ئێـوە سـەیری رواڵـەتی ئەوتان کرد کاتێك کە نامەکە خوێنرایەوە؟ خۆ کچەکەشتان دیت)).

مادام وتی: ((رواڵەتی ئەوم دیت. هەروەها کچەکەشم دیت. مـن ئـەمڕۆ و رۆژانـیتـریش هەر ئەو رواڵەتەی کچەکەم دیتووە. لە سەر شەقامدا لە پـاڵ زیندانەکەشـدا هـەر دیتوومـە. وازی لێبێنن با ئاگدار بێتەوە. بەڵام ئێوە ئەتانەوێ ئەو پیاوە ئازاد بکـەن، لـە ئێـستاوە دەی ئەگەر ئەتوانن بیکەن)).

دیفارج وتی: ((نە)).

مادام وتی: ((گوێ رایەڵن. ئەم بنەماڵەیە لە مێـژە لـە نێـو لیـستەکەی منـدا بـەزاڵـم و غەدرکەر ناوبراون. کاتێك کە مێردەکەی من ئەو نامەیەی لە زیندانی باستیلدا پەیداکرد لـە

بەر تیشکی ئەو چراوکەدا خوێندمانەوە. کە تەواومان کرد نهێنییەکەم پێوت. ئەو بنەماڵەیە، بەشێوەیەکی زۆر خراپ کەوتبوونە بەر هێرشی ئەو دووبرایە، کە لە بنەماڵەی من بوون. ئەو کوڕەش کە کوژرابوو برای من بوو. خوشکەکەشی خوشکی من بوو)).

دیفارج وتی: ((ئەوە راستە)).

((کە واتە پێیان بڵێ لە هەر کوێیەك رادەوەستن با بوەستن بەڵام داوای دەست بەرداربوونی من نەکەن)).

خەڵکەکانی تر هاتنە نێو مەیخانەکە و ئیتر کۆبونەوەکە تێشکا و هەڵوەشایەوە. پیاوە ئینگلتەراییەکەش پارەی شەڕابەکەی دا و رۆیشتە دەرەوە.

کاتێك کە پیاوەکە گەڕایەوە بۆلای مستر لۆری پیاوماقوولێکی دیت کە بە پەشێوی و بێئارامی بەردەوام بۆخوی پیاسەی دەکرد. دکتۆر مانێت لە سەعات چوارەوە لەو کاتەوە کە لە بانکەوە هاتووەتە دەرەوە کەس نەیدیتووە. ئەوان بەبێ خودی هەر لەوێ چاوەڕوان ببوون هەتا سەعات دە. پاشان مستر لۆری چوو بۆلای لویس و کارتۆنیش لە هۆدەکەی مستر لۆریدا لەپاڵ زۆپاکەدا بە تەنیا دانیشت.

لە دەوری سەعات دوانزدەدا مستر لۆری گەڕایەوە. خێرا پاش چەند کەلیمەیەك دەنگی پێی دکتۆر لە پلەکانەکانەوە هات. هەر ئەوەندە ئەو هاتەماڵەوە، بە ئاشکرایی هەموو ئەو باسانە شارانەوە.

ئەگەر دەربارەی هەر کەسێ هەلویستێ راستەقینە بوایە، یان ئەگەر تەواوی ئەو شەوە لەنێو شەقامەکەدا پیاسەی بکردایە، لە بەر ئەوە بوو کە چاوی بەوان نەکەوێ کە ئەوان پرسیارێکیان لێکرد رواڵەتی ئەو وەڵامی هەموویانی دایەوە.

دکتۆر وتی: ((ناتوانم پەیدای بکەم لەکوێیە؟ کورسییەکەی من لەکوێیە؟)).

سەیری یەکتریان کرد و پێکەوە دڵی هەموویان داکەوت.

دکتۆر هاواری کرد: ((وەرن، وەرن، بیهەڵن دەست بە کارەکەم بکەمەوە، لێم گەڕێن با دەست بە کارەکەم بکەمەوە)).

بێگومان گەڕان بۆ هۆکارەکەی بێسوود بوو، هەر ئەوەیان پێکرا کە هەر کام دەستیان نایە سەر شانی و داوا و داکۆکیان لێکرد کە دانیشێت لە پاڵ زۆپاکەدا و دڵخۆشیان کرد بەم

زووانە کارەکـەی خـۆی دەسـتپێدەکاتەوە. دکتـۆر خـۆی دادا بـۆ سـەندەڵییەکە و بـە چـاوی فرمێسکاوییەوە هەر سەیری ئاگرەکەی دەکرد.

دیسان سەیری یەکتریان کرد.

کارتۆن وتی: «ئاخرین مەجالەکەی تریشمان لە دەست چوو. چاکتر وایە ببرێتەوە بـۆ لای ئەو (کچەکەی). بەڵام پێش ئەوەی کە بڕۆیت تۆزێ گوێم، بۆ رادێرە؟ تۆ دەزانـی مـن بۆچـی داوای لێبوردنت لێدەکەم؟ هۆیەکی باشم هەیە».

مستر لۆری وتی: «شکم لە هیچ شتێك نییە. درێژەی بدەرێ».

کارتۆن دانەوی بۆ ئەوەی پاڵتاوەکەی دکتۆر کە لە زەویدا کەوتبوو هەڵیبگرێت. کـە ئـەو وایکـرد لـە گیرفانەکـەی دکتـۆردا، کیفێکـی بـچکۆلە داکـەوت. کـارتۆنیش هـەڵیگرت. نامەیەکی پێچراوی تێدا بوو. نامەکەی کردەوە بە خۆشـییەوە هـاواری کـرد «خـوای گـەورە سوپاس».

مستر لۆری پرسیاری کرد: «ئەوە چیە؟».

«تۆزێ راوەستە! با یەکەم باسـیکەم لـەکوێوە هـاتووە». دەسـتیکردەوە بـەنـاو گیرفـانی پاڵتاوەکەدا و نامەیەکی تریشی لێدەرهێنا ـ « ئەمە ئەو بەڵگەنامەیە کە من توانیم لـەشـار پێی بێمە دەرەوە. سەیریکەن. ئەبینی ـ سایدنی کارتۆن، پیاوێکی ئینگلتەرایی؟».

مستر لۆری بە هەردوو دەست گرتی و بە قووڵی سەیری رومەتی کارتۆنی کرد.

«هەتا بەیانی بۆم راگرە. ئەبێ بەیانی چارلز ببینم، جا بـیری لێکـەرەوە، پێموایـە باشـتر ئەوەیە لە زینداندا نەبێت. ئەو نامەیەش هەڵگرە کە دکتۆر مانێت لەم بـارەوە هـەڵیگرتووە، بەڕاستی ئەمە مەجال دەدا بە خۆی و کچەکەی و منالەکەی بەم بۆنەوە شارەکە جێبێڵن».

«بەڵێ».

کارتۆن وتی: «ئێستا گوێ رایەڵە. من دەلیلێکم بە دەستەوەیە کە کارکردن لە سەر ئـەو بەڵگەنامەیە ئـەبێ لەبـەر چـاو دکتـۆردا دوور بخرێتـەوە، لـە راسـتیدا ئـەوان لـەخەتـەرێکی گەورەدان. گوێم لە مادام دیفارج بوو ئەمشەو لەبارەی ئەوان قسەیدەکرد. ئەوەنـدەش تەسـك بیر مەکەوە. ئەتوانی هەموویان رزگار کەیت».

«هیوادارم، لەوانەشە بتوانم، بەڵام چۆن؟».

((خەریکم پێت دەڵێم کە چۆن ئەمە پێوەندی بە خۆتەوە هەیە کە ئەمەش ناتوانێ کاری پیاوێکی لە تۆ چاکتر بێت. ئەوان بێشك تا چەند رۆژێکی تریش هەر بێوەی ئەبن)).

((بەڵێ)).

((تۆ پارەت هەیە. بە خێرایی ئەو هاتن و چونانەی کە بۆ کەناری دەریا دەکرێن بیانکرێت. سەر لە بەیانی لە سەعات دوو دا ئەتوانی هەموو ئەسپەکان ئامادە کەیت بۆ دەستپێکردن)).

((ئەوە دەکرێت!)).

((تۆ دڵت دەوڵەمەندە دەتوانی بە کچەکە (لویس) بڵێیت خۆت دەزانی گیانی خۆت و باوکی و منداڵەکەت لە مەترسیدان. پێی بڵێ ئەبێ پاریس بە جێبێڵێت. ئەبێ پێی بڵێ کە ئەمە یەکێك لە ئاواتەکانی مێردەکەیەتی. پێ بڵێ پێوەندی هەیە بەوەوە کە بڕوای بە خۆراگری هەبێت یان هەروا ئومێدەوار بێت. هەموو ئەو دارشتنە لەم حەوشەیەدا پێکهاتووە. ئەبێ لە ناو گارییەکدا جێی بۆخۆی دانێ. نایەوێت چاوەڕوانی بکێشێ. با جێگەکەی منیش بگرێتەوە، پاشان ملی رێ گرت بۆ ئینگلتەرا!)).

((تێدەگم، ئەبێ چاوەڕوانی هەوڵەکانی دواتری تۆ بم؟)).

((تۆ بە رەحەتییەوە بەڵگەنامەکەی منت بەدەستەوەیە. بەس هەر چاوەڕوانی ئەمە بە چۆن جێگەکەی من بگرێت)).

((دەی خۆ ئەبێ پیاوێکی گەنجم ببێت لام دانیشێت؟)).

((بێگومان ئەبێ وابێ! بەڵام تۆ جارێ ئیجازەم لێبگرە و بکەوە دوای بۆچونەکانم)).

((تکا دەکەم!)).

((ئەرکەکەت بەجێ بێنە. جا منیش کارە سەرەکییەکانت بۆ دەکەم. خوات لەگەڵ!)).

کارتۆن لە بردنی دکتۆردا بۆ لای کچەکەی یارمەتی مستر لۆری دا. لەدەم دەرگاکەدا ئەوانی بە جێهێشت و بۆ چەند دەقەیەك بە تەنها مایەوە. لەوێ سەیری تیشکی چراکانی هۆدەکەی لویس دەکرد. پێش دوورکەوتنەوە لەوێ بە نیشانەی خۆشەویستی ئاخرین هەناسەی قووڵی بەرامبەر بە لویس کێشا.

## - ٢٤ -

# سایدنی کارتۆن نامەیەك دەنووسێ

چارلز دارنی، بە تەنیا لە زیندان دایە و هیچ ئومێدێکی نەماوە. پاش گوێ گرتن لە نامەکەی دکتۆر، هەروەها هەرا و هۆریا کێشانی خەڵك تێگەیشت کە هیچ سەرنجێکی ئومێدوار بۆ ئازاد بوونی نەماوەتەوە. ئەو دەشیزانی کە ئەبێ بمرێت نەك لە پێناوی جینایەتێکدا کە خۆی کردبێتی، بەڵام دیارە لە پێناوی ئەو هەموو جینایەتەدایە کە لە لایەن زۆربەی دەرەبەگەکانەوە یان بنەماڵە ملهوڕەکانەوە بە سەر ملوێن خەڵکی بێدیفاعەوە ئەنجامدراون.

بەڵام مەرگ شتێکی سەختە. جوداییش هەر سەختە، کە بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە ژنی خۆشەویستی خۆت و منالّی بە باوەش بەخێو کراوت پاش ماوەیەکی زۆر، دووری بەجێبێڵیت. بەڵام هەر بیر کردنەوە لەو چارەنووسە رەشە و لەدواییدا دیدارێکی ئاوا جێگەی دڵگەرمییە. ژمارەیەك لەو کەسانەش هەر بێ گوناح مەحکووم بەو جینایەتانە بوون، کە بەو رێگەدا چوون و هەموو رۆژێ ئەو رێگەیان تا کۆتایی پێواوە. هەروا کاتێك کە هێور بووەوە دانیشت بۆ ئەوەی کە بۆ خۆشەویستەکانی ئاخرین نامە بنوسێ.

بۆ لویس نووسی:

((...من هیچم دەربارەی زیندانی بوونی باوکت نەدەزانی، تا ئەو کاتەی کە خوت پێت وتم. من ئەمەشم نەدەزانی کەئەوانەی کە زۆریان لە باوکت کردووە، مامە و باوکی من بوون. من ناوی ئەسڵی خۆم بە باوکت وت. ئیڤرمۆند. بەڵام ئەو بە منی وت کە لەمبارەوە بەتۆ هێچ شتێك نەڵێم. بەڵام هەر هێشتا هێشتی زەماوەند کەین. گومانی تێدا نییە کە باوکت ئەو نامەیە کە لە کونە دیواری زۆپای زیندانی باستیلدا شاردوویەتەوە لە ناو چووە یان لە کاتی سوتاندنی باستیلدا ئەویش سووتاوە. یان

لەوانەیە هەر لە بیریشی نەمابێ. باوکت دڵنیا نەبوو. ڕێگە بە باوکت نەدەی بەهیچ شێوەیەك خۆی تاوانبار كات.

شمشێر و تۆڵە ئەستاندن لە بیر بەرەوە روو بکەرە ژیان و ژیانیش بە باوکت بەخشە و ئاگایشت لەو منداڵە بێت باش بەخێوی کەی. رۆژێك ئەبێ ئەگەر لە دوای مەرگیش بێت خۆشی ببینن و یەکتریش دووبارە بگرینەوە)).

هەروەها نامەیەکیشی بۆ دکتۆر نوسیبوو، کە ژنەکەی و منالەکەی دابوویە دەستی ئەو داوای کردبوو کە ئاگای لێیان بێت.(بەم واتە، وای بۆ دەچوو لەوانەیە بەرگریبکات لەوەی کە نەخوازەڵا دکتۆر لە دەلیلەکەی خۆی بگەڕێتەوە).

ئاخرین نامە کە نووسی بۆ مستر لۆری بوو. کەتێیدا شیکردبووەوە کە چۆن ئەبێ سوپاس و پێزانینی خۆی بەرامبەر ئەو هەلویستە دۆستانەی کە لەجیهاندا بێوێنەیە دەربڕێ. هەر بیری سایدنی کارتۆنی نەبوو. مێشکی پڕ بوو لەوانەی قەت تیشکی بیر و راوێژیان بۆ نەدەهاوێشت.

چارلز دارنی پێش ئەوەی چراوکەکان ببڕێنە دەرەوە نامەکانی تەواو کرد.

کاتێك کە ناو هۆدەکە تاریك بوو ئەمجار راکشا و بیری لەوە کردەوە کە چۆن تەمەنی تەواو بوو دنیای بەجێهێشت. بەڵام دنیا، ئەو دنیا رۆشنەی کە ئەو حەزی لێدەکرد پاش خەو لێکەوتن هاتەوە خەونەکەی. وا هاتە خەیاڵییەوە کە گەڕاوەتەوە بۆماڵەکەی خوی لە ((سوهۆی لەندەن))، خۆشحاڵ و سەربەخۆیە. لویس پێیدەوت تۆ نیازت پاك نەبووە. خەیاڵت خراپ بووە بۆیە هەر لە کۆڵی نەدەبۆوە و جێ نەدەهێشت. پاشان بۆچرکەیەك بە خەبەر بووەوە، پاشانیش نیوە خەوتوو و نیوە خەبەر وەنەوزی دەدا و ماوەیەکی درێژ خایەن وردە وردە چەند سەعات خۆی حەواندەوە.

لەکۆتاییدا، هەر لەگەڵ هەڵهاتنی یەکەم تیشکی سەر لەبەیانیدا سێبەرێی تاریکی بەو بەیانییە زووە لە مێشکی هاتە دەرەوە و ئەو جار زانی کە رۆژێکیتر لەژیانی هاتەپێشەوە. ئەویش و پەنجاو یەك نەفەری تریش. ئەبێ هیچکام سەر لە بەیانی رۆژێکیتر بە چاو نەبینن.

خۆی دەیزانی کە چۆن دەمرێ، بەڵام قەت ئەو مەکینەی کە کۆتایی بە ژیانی

دەهێنیٚ نەدیتبوو. دەستیکرد بە لێکولێنەوە دەربارەی ئەو مەکینە. ئاخۆ چۆن بێت، ئاخۆ کام لای روالّەتی بەر کەویٚت. ئاخۆ ئەو یەکەمین کەس بێت یان ئاخرین نەفەر کە بەری کەویٚت. ئەمەو چەند بیر و بیروکێکیتریش هاتنەوە یادی. هەر وەك ئەو ساتانەی سەر لە بەیانی بە سەریدا تێپەڕی کرد.

هەر خوار و ژووری دەکرد سەعات هەر کاتەکانی دەژمارد ئەو کاتانەی لەوانەیە ئەو جارێکیتر گویٚ لێنەبێت. بۆ هەمیشە نۆ و دە و یازدە تێپەڕی کرد.

ئێستا بیری ئاشتی و ئاسایش لە مێشکی دایە. بەپاکی و خاوێنی ناوی ئەو خۆشەویستانەی دەهاتنەوە یاد و دۆعای خێری بۆ دەکردن.

بۆ هەمیشە ئەوا دوازدەیش تێپەڕی کرد.

ئەو پێیوترا بوو ئاخرین کات سەعات سێیە. بەلاّم خۆی دەیزانی کە ئەوان پێش ئەو سەعاتە دێن بەدوایدا. هات و چوو و تێپەڕکردن بە ناو شەقامەکەدا بۆ ئەڕابە گەورەکان قورس بوو زۆری دەخایاند. ئەو هێشتا دوو سەعاتی ماوە بۆ ئەو کاتەی کە ئەبیٚ چاوەڕوان بێت بێن بە دوایدا. بۆیە بڕیاریدا ورەی خۆی پتەوتر بکات و بەم بۆنەشەوە لەوانەیە بۆ دوا بواریش کە پێوەندیگریٚ بە کۆچەرەکانەوە(مسافرەکان) ئەبیٚ بە ورەی قایمەوە بڕواتە نێو شەقامەوە.

بەلیٚ هەر دەنگی دەهات لەکاتێکدا کە هەردوو قۆلّی بە سنگ و مەمکییەوە بەسترابوون هەر دەهات و دەچوو. بە سەرسوڕمانەوە دەنگی لێدانی سەعات یەك هاتە گوێی. سوپاسیکرد لە مەزنایەتی (خوای مەزن) بۆ ئەو هێمنیەی کە لە مێشکیدایە. بیری کردەوە. ((تەنها یەك سەعات ماوە بۆ چاوەڕوانی)). دیسان گەڕایەوە بۆ پیاسە.

راوەستا، گوێی لە دەنگی پیٚ بوو لە دەرەوەی دەرگاکەوە. کلیلێك خرایە نێو کێلونەکەوە و هەلّخولا. هەر ئەوەندە کە دەرگاکە کرایەوە پیاوێك بە سووکی وتی: ((ئەو قەت منی لێرەدا نەدیوە. من هەر چاوم لە رێگەکەیەوە بوو. بە تەنیا خۆت بڕۆ. من لێرەدا چاوەڕوان دەمێنمەوە. کاتت بە فیڕۆ مەدە)).

پاشان بە پەلە خێرا دەرگاکە کرایەوە و داخرایەوە. لەوێش پێشتر لە ئەو، رووبەڕوو بووەوە لەگەلّ یەکێکی سمێل سپی، کە پەنجەییێکی بەرزکردەوە و راوەستابوو

کە سایدنی کارتۆن بوو.

هەندێ شت ڕۆشن و لە بەر چاودا بوون. دەربارەی سایدنی کارتۆن بۆچرکەیەك چارلز دارنی وای دەزانی ئەمە دێو و درنجە کە ئەو دەیبینێ. بەڵام کە قسەی کرد زانی کارتۆنە. لەراستیدا ئەو دەستەی کە دەستی ئەوی دەگوشی هەر ئەبێ دەستی کارتۆن بێ.

کارتۆن وتی: ((لەناو هەموو خەڵکی ئەم کەونەدا تۆ بیرت لەو نەدەکردەوە کە لێرەدا چاوت بە من بکەوێت. دەت کردەوە؟)).

بە دڵ پەشێوییەوە پرسیاریکرد: ((نەمتوانی بڕوا بکەم کە ئەمە تۆ بیت. ئێستاش هەر بەسەختی بڕوا دەکەم، تۆش زیندانی نیت؟)).

((نە، بە ڕێکەوت من بەبۆنەی هێزێکەوە دەتوانم بەو ئەفسەرەش کە لێرەدایە دەستوور بدەم و ئێستاش هەر بەم هێوریەوە کە لێرەدا لە بەر دەمتا وەستاوم.دارنی خۆشەویست. من لە لایەن ئەوەوە هاتووم ـ ژنەکەت)).

زیندانییەکە (دارنی) دەستی کارتۆنی گوشی و کارتۆنیش هەر درێژەی دایە و وتی: ((من لە لایەن ئەوەوە(ژنەکەی) تکایەکی بە پەلەم بۆ هێناوی. ئەو داوای لێکردیت، هەروەها کە ئەوت خۆش ئەوێت راستەوخۆ ئەوەی ئەبێ کە پێت دەڵێم ئەنجامی بدەیت پێویست ناکات پرسیارم لێبکەیت. لە بەر ئەوە من کاتی وەڵامدانەوەم نییە. تۆ بەس لە سەرتە ئەوەی کە من دەڵێم ئەنجامیبدەیت، هەروەها کە ئەو دەستووری داوە. ئەو چەکمانەی کە لەپێی دەکەیت دایکەنە و ئەمانەی خۆم بکەرە پێت)).

بە تەمووی دیواری هۆدە تاکە کەسیەکەوە کورسییەك دانرابوو لە پشت زیندانییەکەوە. کارتۆن پاڵی تێوە ناو خێرا وەك هەورەتریشقە گرتی و جلەکانی لە بەرداماڵی و رووتی کردەوە.

((ئادەی خێرا ئەوانە بکەرە بەرت)).

((کارتۆن کەس لێرە دەرناچێ، کەس تا ئێستە نەیتوانیوە لێرە راکات. هەوڵدان بۆ راکردن لێرە شێتانەیە)).

((من داوام لێکردوویت راکەیت؟ ئەگەر وتم ئا لەو دەرگا بڕۆ دەرەوە ئەو جارەش

تۆبلێ شێتانەیە. ئەو پاڵتاوەت داکەنە و ئەوەی من بکەرە بەرت)).

دارنی وەك منالێ وا بوو بەدەست کارتۆنەوە. سایدنی بۆ خۆی دارای بڕوای پتەو بوو. هەروەها ئومێدەواریش بوو. چارلز هەر منجەی دەکرد و بەرگری ئەکرد. کەم تا فرەیەك دەترسا و نەیدەزانی خەوتووە یان خەبەرە تۆ بلێی خەون ببینێت؟.

((بەڵام کارتۆن، کارتۆنی خۆشەویستیم من تێناگەم)).

((نامەوێ تۆ لێی تێبگەیت. ئەمە هەر ئەوەیە کە ژنەکەت دەی هەوێت. تۆ ئەبێ ملکەچی ئەو بیت ئەمە ئاخرین داواکاری ئەوە)).

((تۆ کاری باش ناکەیت، تۆخەریکی خۆت لە پێناوی مندا ئەمرێنی. رێگەی راکردن نییە)).

((داوام لێ کردویت، دارنی خۆشەویست. لەو دەرگا بچیتە دەرەوە؟ ئەگەر داوام لێکردیت مەیکە. بە سەر ئەو مێزەوە قەڵەم و کاغەز هەیە. دەستت گۆ دەکات بنوسی؟)).

((پێش ئەوەی کە تۆ بێیت نووسیومە)).

((دەستت بخەرە رێ و ئەوەی کە پێت دەڵێم بنووسە خێرا. هاوڕێ، خێرا! ئەوەی کە پێت دەڵێم ئەنجامی بدە)).

دارنی بە دەستی سەری خۆی گوشی و لە سەر کورسییەکە دانیشت. کارتۆن کە دەستی راستی لەباخەڵیدا بوو بە پێوە بە سەریەوە وەستابوو.

((رێك و پێك هەرچێکم وت دەینووسی)).

((بۆ ئەو کەسەیەکە ئادرەسی پێدەدەم؟)).

((بۆ کەس نییە، فەقەت ئەوەی کە دەڵێم بینوسە)).

زیندانییەکە قەڵەمی هەڵگرت و ئامادە بوو بۆ نووسین.

کارتۆن وتی: ((لە بیرتە؟ (( بنووسە)) لە بیرتە... ئەو هەموو وت و وێژەی کە لەمەوپێش لەنێوانماندا ئاڵ و گۆڕ کران. ئەمە لە سروشتی تۆدا نییە کە لەبیرت بچێتەوە)).

کارتۆن هەندێ شتی بە دەستەوە بوو. دەستیشی لەگەڵ قسەکانیدا دەجووڵاند.

((نوسیووته. له بیرم چون؟)).

((ئەی ئەوە چییە بەدەستەوە؟ چەکە؟)).

((ئەمن چەکدار نیم)).

((ئەی ئەوە چییە؟)).

((له یەك چرکەدا تێدەگەی چییە. تۆ بنووسە: ((مـن سوپاسـکارم کـه کـاتی ئـەوە هاتووە ئەو چەند وشەیە بنوسم. ودەشی بنوسم)). دیـارە ئەمـەش هۆکـەی پەژارەیـەك یان پەشیمان نییە)).

کاتێك که ئەم قسانەی دەکرد، ئارام ئارام، دەستی به شلی هێنایه سەر رووومـەتی نووسەرەکە.

پێنووسەکه له دەستی دارِنی داکـەوت. سـەیری دەور و پـشتی خـۆی بـەبێ بڕواییـەوە کرد.

((ئەوە بۆنی چی دێت؟)).

((بـۆن؟ مـن هـیچ بۆنێـك نابیـسم. ئێـرە هیـچی بۆنـداری تێـدا نییـە. خێراکـە پێنووسەکه هەڵگرە و تەواویکە.. خێراکە.. دەی خێرا!)).

زیندانییەکـە دیـسان پێنووسـەکەی هەڵگرتـەوە. وا گومـان دەکـرا کـه لـه بـەکار هێنانی بیر و رای خۆیدا تووشی کێشەیەك بووبێت. بـه چـاولێڵییەوە سـەیری کـارتۆنی کرد. بەڵام هەر زیاتر به سەر بەڵگەکەدا دادەنەوی.

کارتۆن هەر دووپاتی کردەوە ((له بەر پەژارەیە یـان لـه بـەر پەشـیمانی)). دیـسان هەر دەستی شل بووەوە، ئارام و بێ دەنگ. سەیری پێنووسەکەی کرد. روانی خەریکی نووسینی هەندێ شتی بێ مانایه به سەر وەرەقەکەوە.

پێنووسەکه لەدەستی داکەوت. ویستی هەستێته سەر پێ بـەڵام ئـەژنۆکانی لـه ژێـر کۆنترۆڵی خۆیدا نەبوون. کارتۆن باوەشی کرد بەناو قەدیدا و نایەی بن دەستی خۆی و بـه کوتێ پەڕۆ دەم و لووتی خنی. بۆ چەند چرکەیەك دارِنی لەگەڵ ئـەو پیـاوەی کـه هـاتبوو گیانی خۆی پێبەخشی شەڕیکرد. پاشان بێ هەست و هەواس کەوته زەوی و راکشا.

بێدەنگ و خێرا، کـارتۆن خـۆی گـۆڕی و زیندانییەکـەش هـەروا بـەلادا لـەزەویدا

کـەوتبوو. پاشـان بـە سـووکی بـانگیکرد: ((ئێـستا دەتـوانی بێیتـە ژوورەوە. وەرە ژوورەوە)).

بارسادی جاسووس خۆی بۆ ئامادە کردبوو.

کارتۆن وتی: ((بەراستی؟ ئەزانی مەترسییەکەی زۆر گەورەیە؟)).

کارتۆن دانەوی بۆ سەر ئەژنۆ لەگەڵ ڕەفیقەکەیـدا و نامەیـەکی نووسـراوی خـستە نێو گیرفانی پاڵتاوەکەی شوێنێك کە بدۆزرێتەوە)).

جاسووسەکە بە پەشێوی وتی: ((مستر کارتۆن، ئەگەر لە قسەکانتدا راستت کردبێ ئەوا من هیچ مەترسییەکم نییە)).

((لێم مەترسە. هەتا ئەمرم راستم لەگەڵتا)).

((ئەبێ راستبیت. مستر کـارتۆن، ئەگـەر ژمارەکـە راسـتبێت، ئـەمڕۆ پـەنجاو دوو کەس ئەبێ بمرن. ئەگەر تۆش بەو جلو بەرگانەوە بتـوانی ژمارەکـە تـەواو کـەیت ئـەوا ئیتر منیش هیچ خەمم نییە)).

((خەمی ئەوت نەبێ! خێرا ئەبێ لەم ڕێگە پڕمەترسییەدا، کە بۆ تۆ، یان بـۆ هـەر کەسێکیتر زیانی هەبێت دەرباز بم. بۆ ئەوانی دیکەش. لەوانەیە تکا لە خـودا بکـەن با لێرەدا خێرا دوور بکەونەوە. ئێستاش داوای یارمەتی بکە و بیکە بـە هـاوار و مـن هەڵگرە بۆ ناو گارییەکە)).

جاسووسەکە پرسیاریکرد: ((تۆ...؟!)).

((لەگەڵ ئەوا، هەڵبەتە خۆمـان گۆڕیوەتـەوە. تـۆ ئـەتوانی بڕۆیتـە دەرەوە بـۆ لای دەرگاکە هەر ئەو شوێنەی کە خوت منت لێهێنایە ژوورەوە؟)).

((هەڵبەتە)).

((ئەو کاتە کە تۆمنت هێنایە ژوورەوە و من زۆر کز و لاواز بـووم. ئـاخرین دیـدار لەگەڵ دۆستەکەم زۆر بوو بۆ من. شـتی لـەو بابەتـەش هـەر پێـشتر روویـداوە. ئەمـە یەکەم جار نییە کە لە کاتی خواحافیزیدا دۆستێك بە کزی ئاخرین ماڵ ئـاوایی بکـات وایە؟ گیانی خۆت بە دەستی خۆتەوەیە، خێرا! هاوار کە داوای یارمەتی یکە!)).

((سوێند دەخۆی کە نامبەیتە مەحکەمەوە؟)).

«پیاو، پیاوە...! ئەی پێشتر سوێندم بۆ نەخواردیت؟ بۆ چی ئەو کاتە بە نرخە بە فیرۆ دەدەی؟ دەی هەڵیگرە بیبەرە حەوشەکە. خۆت شارەزایت، خۆت بیخەرە نێو گارییەکەوە. خۆت بیبە نیشانی مستر لۆری بدە پێی بڵێ پێشەکی هیچی وەك خواردن پێنەدات. بەڵام هەوای ئازادی پێ بگەیەنن. دەربارەی قسەکانی منیش بڵێ بە مستر لۆری بیری لێبکاتەوە. هەروەها بیریشکاتەوە لە بەڵێنەکانی خۆی بۆ ئەوەی کە ئەبێ دوورە پەرێز بێت».

بارسادی جاسووس رۆیشتە دەرەوە. کارتۆن خۆی لەسەر مێزەکەدا دانیشت. سەری نابوو بە سەر هەر دوو دەستیدا. جاسووسەکە خێرا لەگەڵ دوو پیاودا گەڕایەوە.

یەکێکیان سەیری تەرمە کەوتووەکەی کرد و وتی: «سەلام! ئاخرین خواحافیزی لێبکە چۆن لەوانەیە هەر زۆر بێت بۆ ئەو. وایە؟ ئەو لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە رۆژ باش بە گالیۆتینە دەکرێتدا نییە و حەزی لێ ناکات».

پیاوەکە لەسەرخۆچووەکەیان بەهەر دووکیان هەڵگرت لە بەینی خۆیاندا کێشیان کردبوو دەمە و دەرگاکە.

جاسووسەکە بە دەنگێکی ئاگادارکەرەوە وتی: «ئیڤرمۆند. کات کەمە».

کارتۆن وەڵامی دایەوە «باش ئەزانم، ئاگات لە دۆستەکەم بێت. تکات لێدەکەم بە تەنهاش جێم بێلە».

بارساد وتی: «هاوڕێیانی باش. دەی وەرن. با بڕۆین ئەو جێ بێڵین».

دەرگاکە داخرا، کلیلەکە خرایەوە نێو کێلونەکە و بە سەر کارتۆندا کە بە تەنها لەو دیو بوو داخرا. گوێیگرت بۆ هەر دەنگێکی وەك ئاگادار کەرەوە بەڵام هیچ شتێك رووی نەدا. جگە لە دەنگی ئاسایی زیندانەکە هیچیتر نەبوو.

هیچ هاوار و قیژەیەك نەبوو. پەلە و پەلە کوتێش هەر نەبوو. بە ئازادییەکی زۆرەوە دەستیکرد بە هەناسە کێشان. بەڵام هێشتا هەر گوێی رایەشتبوو بۆ زەنگی سەعات دوو.

پاشان دەنگە دەنگ دەهات، دەنگی شتێکی ناسراو بوو کەئەو لێی دەگەیشت: بۆ ئەو دەنگەش خۆی ئامادە کردبوو. چەند دەرگایەك، یەك لەدوای یەك دەکرانەوە تا

لەکۆتاییدا هینەکەی ئەو کرایەوە. نگابانێکی زیندانەکە بوو کە لیستەیەکی لە ناوی زیندانییەکان بە دەستەوە بوو سەیری ئەوی کرد وتی: ((وەرە بەدوای مندا ئیڤرمۆند)).
سایدنی هەستا و کەوت دوای ئەو تا گەیشتنە هۆدە درێژەکە کە شوێنێکی تاریك و نوتەك بوو. کە نیوە بوو لە خەڵکدا. کە هێنابوونیان بۆ ئەوەی لەویٚ دەستیان ببەستنەوە. هەندێ بە پێوە وەستابوون هەندێ دانیشتبوون. هەندێ دەگریان و ئەوانی دیکەش بێئارام بە دەور خۆیاندا دەگەڕان. بەڵام زۆربەیان بێدەنگ و بێ جوولە بوون و لە نگابانەکان ماق مابوون و مڕیان لێدەکردەوە.
سایدنی کارتۆن لە سووچێکەوە بە تاریکی وەستابوو. پیاوێك کە لە بەردەمیا دەڕۆیشت بۆ ئەوەی سەلامی لیٚ بکات تۆزێ وەستا. بەڵام دوایی ڕۆیشت. پاش تاوێ ئافرەتێکی گەنج لە سەر جێگەکەیدا دانیشتبوو هەستا و هاتە لایەوە کە قسەی لەگەڵ بکات.وەك کچێکی نەرم و نیان وابوو. دەم و چاو باریك و لەڕ بوو بەڵام خۆشڕوو و شیرین بوو بە رواڵەتیەوە جێی دەوا و درمان نەدەبینرا.
کچەکە بە دەستە چیاوەکانی دەستی ئەوی گرتو وتی: ((ئیڤرمۆندی هاوشاری، من هەر ئەو کیژۆڵە هەژارەم کە لەزیندانی ((لا-فۆرس)) خەیاتیم دەکرد لەگەڵ تۆدابووم)).
ئەویش پرتەیەکی لێوە هات ((راستە، لە بیرم نەماوە کە بۆ چی تاوانبار کرابوویت)).
((فێڵ و تەڵەکە، ئەو مەزنایەتییە دەزانیٚ کەمن بێ گوناحم. کێیە بیر لەوە دەکاتەوە کە هەژار و لاوازێکی دروستکاری وەك من تاوانبار دەکات؟)).
بەو خەم و پەژارەوە زەردەخەنەیەك گرتی لەو کاتە کە قسەی دەکرد فرمێسك لە چاوەکانی سایدنی هاتنە خوار.
((خۆ لەوە ناترسم کە بمرم لە بەر ئەوەی هیچ شتێکی ناڕەوام نەکردووە. ئەگەر ئەو کۆمارە کە ئەبێ بە هانای هەژارانەوە بێت و ئەگەر لە بەر ئەو مەبەستەیە کە مردنی من قازانجی بۆ ئەو بێت، ئەوا قەینا کە من حەز بەو مەرگە دەکەم. بەڵام داخوا تەرمی هەژارێکی لاوازی وەك من ئەبێ چ جێگەیەك بگرێت!؟)).
پەژارەیەکی گەورە دڵی سایدنی پڕکرد و وایلێکرد هەر سەیریبکات و گوێی بۆ

بگرێت. ئەو (کچەکە) ئاخرین کەس بوو کە ئەبوا قسەی لەگەڵ بکات.

((باوەڕەکەی بیستم کە ئازاد بوویت. هاوشاری ئیڤرمۆند. هیوادارم راست بێت)).

((بەڵێ وا بوو بەڵام دووبارە گیرامەوە)).

((هاوشاری ئیڤرمۆند، ئەگەر هێشتیان پێکەوە سوار بین، ئەیەڵی دەستت بگرم؟ خۆ من ناترسم، بەڵام من بچکۆلەو لاوازم. کە ئەمەش ورەم پێ دەدات)).

کە کچەکە چاوە پڕ لەئازارەکانی لە چاوی ئەو گێڕا. ئەمجار ئەویش لەپڕ گومانێکی حاسل کرد. بۆیە سەری سوڕما. بەدەستە ماندووەکانی بەدەست برسی و نەحەساوەکانی دەستی نا بەدەمیدا و توند گوشی.

کچەکەش بە چپە وتی: ((خۆتیان بۆ دەدەی بەکوشت؟)).

((وس...! ئەرێ، لە بەر کچەکە و ژنەکەیەتی)).

((ئەی لاوەکی (غەریبە)ی لە خۆ بردوو، ئێستا دەیەڵی دەستەکانت بگرم؟)).

((وس...! ئەرێ، خوشکی هەژاری خۆم! بۆ ئاخرین جار)).

# - ٢٥ -

## تەواو بوون لە (پاریس)دا

خەریك بوو سێبەر دەهاتەوە بە سەر دەرگای زیندانەکەدا. سێبەر بە سەر دروازەکانی شاریشدا خەریك بوو دەهاتەوە، گارییەك خەریك بوو لە پاریس دەردەچوو، بەرەو ئەو دەروازانە دەچوو کە دەبێ هەڵسەنگێنرێن.

((کێیە لێوە دەڕوات؟ بەڵگەنامەکەت!)).

بەڵگەکان دەستا و دەست کەوتن و دەخوێندارنەوە.

((ئەلکساندەر مانێت، دکتۆری فەرەنسی. کێیە؟)).

((ئەو پیاوەیە: ئەو پیاوە پیر و لاواز و پەككەوتە)).

((وادیارەدکتۆر لە سەر حاڵی خۆی نییە. بڵێی لەوانەیە خۆشەویستی شۆڕش زیاتر بووبێ لەوەی کە دکتۆر تاقەتی لێ هەبێ؟)).

((زیاتر لە تاقەتی دکتۆر)).

((ئەها زۆربەی ئازارەکەی! لویس کچەکەی بوو. ئەو فەرەنسییە. کچەکەی کێیە؟)).

((ئەمە ئەویش)).

((لویس. ژنەکەی ئیڤرمۆند، ئەمە نییە؟)).

((خۆیەتی)).

((ئەها! ئیڤرمۆند. لە هەر جێگەیەکی تریشدا جێگەی سەرنجە! لویسە چکۆل، منداڵەکەی خەڵکی ئینگلتەرایە. ئەمە خۆیەتی؟)).

((بەڵێ)).

((وەرە ماچمکە منداڵەکەی ئیڤرمۆند. تۆ هاوشارییەکی کۆمارەکەت ماچکردووە. هەندێ شت لە بنەماڵەدا نوێیە! سایدنی کارتۆن دادپەروەر ئینگلتەرایی کامەیە؟)).

((لێرەدا راکشاوە)).

((بووراوەتەوە؟)).

((هیوادارین بەم زووانە لە هەوایەکی تازەدا بێتەوە سەر خۆ. ئەو پەشێوی ئەوەیە کە یەکێك لەدۆستەکانی بەرێوەیە بۆ ژێر گالیۆتینە)).

((جا وایە؟ خۆ ئەوە شتێکی مەترسیداری ئەوتۆنییە! وێنەیان زۆرن. جارویس لۆری کارمەندی بانکە، خەڵکی ئینگلتەرا، کامەیە؟)).

((ئەوە خۆمم. هەر پێویستە خۆم ئاخرین کەس بم)).

ئەو کەسەی کە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دەدایەوە جارویس لۆری بوو. لە پاڵ دەرگای گاریەکەدا راوەستا بوو لەگەڵ تاقمێ لە رەسمییەکاندا (دەرەجەدارەکان) قسەیدەکرد. بە ئارامی گارییەکەیان پشکنی و جانتاکانیش کە بە سەر بانی گارییەکەوە بوو هەر گەڕان)).

((فەرموو ئەمەش بەڵگەکانت. جاروێس لۆری. ئیمزایان بکە)).

((هاوشاری. ئێمە دەتوانین بڕۆین)).

((ئەتوانن بڕۆن لێخوڕن بۆپێشەوە! سەفەر بە خێر!)).

یەکەمین مەترسی تێپەڕی کرد.

ترس و لەرز لێرەدایە لەناو گاریەکەدا. گریان و دڵە خورپێ و هەنسکدانی مسافرەکان.

لویس وتی: ((ناتوانین تۆزێ بە پەلەتر بڕۆین)).

مستر لۆری وەڵامی دایەوە: ((وەك ئەوە وایە کە گومان بکرێت ئێمە ئەمانەوەێ هەڵبێین بۆیەش لەولاترەوە کەس نایە بەدواماندا)).

بەم زووانە لە شار دەرچوون، گەیشتنە لادێیەك. بەپاڵ چەند کۆلیتێکدا تێپەڕیان کرد کە دوو دوو و سێ سێ لە پاڵ یەکدا بوون. بە ناو شەقامەکاندا تێپەڕیان کرد کە درەختەکانی گەڵایان لێ بڕابوو. بە پاڵ زەوی و زار و ماڵە وێرانەکاندا تێپەڕیان کرد.

ئەسپەکان گۆڕان. رۆیشتن بە ناو لادێیەکدا. خوار و ژوور ئەم گرد و ئەو گرد تا بەناو رێگەیەکی باریکدا رۆیشتن. لە پڕ دەنگی هاوارێك هات.

((هۆ! ئێوە لە ناو گارییەکدا! قسە بکەن!)).

مستر لۆری لە دەلاقەی گارییەکەوە روانی بۆ دەرەوە پرسیاری کرد:))ئەو چی بوو؟)).

((ئەمڕۆ چەن زۆر بوو؟)).

((لێتان تێناگەم)).

((ئەمڕۆ بۆ گالیۆتینە چەن زۆرن؟)).

((پەنجا و دوو کەس)).

((منیش وتم! ژمارەیەکی باشن هاوڕێیەکی هاوشاریم لێرە وای دەزانی کە چل و دوو کەسن. دە سەر زیاتر بوو! حەز دەکەم! حەز لە گالیۆتینە دەکەم!)).

شەوگار تەواو بوو. مسافرەکان لەسوچێکی گارییەکەدا بە خۆدا هاتنەوە و دەستیانکرد بە وت و وێژ. ((بڕوانن بۆ دەرەوە! بڕوانن بۆ دەرەوە! و سەیر بکەن بزانن چۆن بڕوا دەکەن!)). کزەبا دوا بە دواییان هەڕەشەی دەکرد و هەوری رەشیش بەدوایاندا دەهات. بەڵام ئەوان لەولاترەوە بەهیچ شتێکیتریش بڕوایان نەدەکرد!

## - ٢٦ -

# دروومان کۆتایی پێ هات

لەکاتێکدا پەنجا و دوو کەس ژن و پیاو کە خەریك بوو ئاخرین ساتەکانی ژیانیان بە سەر دەبرد لە رووی زەویدا. مادام دیفارج لەگەڵ هاوڕێکەیدا، ڤینگێنس و ئەوی‌تریش جاکیۆسی سێیەم لە کۆڵێتەکەی داربڕەکە(جاکیۆسی سێیەم) قسەی دەکرد.

جاکیۆسی سێیەم یەکێك بوو لە ئەندامەکانی هەیئەتی مونسیفە. داربڕەکە (ئەوەی کە لەمەو پێش دروستکەری رێگە و بان بوو) لەولاترەوە دانیشتبوو هیچی نەدەگوت تا رووی قسەیان تێ نەکردایە.

جاکیۆسی سێیەم وتی: ((دیفارجەکەی خۆمان بە دڵنیاییەوە کۆماریخوازێکی باشە، وا نییە؟)).

ڤینگێنسیش هەرایەکی کرد: ((لە فەڕەنسادا لەو باشتر نییە)).

مادام دیفارج وتی: ((ڤینگێنسی چکۆلە، تۆزێ هێمن بە، مێردەکەم بەدڵنیاییەوە چاکترین کۆماریخواز و بەخێرەترین پیاوە. سزاواری سوپاس و پێزانینی کۆمارەکە بووە. بەڵام ئەو یەك لاوازی هەیە. ئەویش ئەوەیە کە هەر بۆ دکتۆر پەژیوە)).

جاکیۆسی سێیەم وتی:))پەژارەیەکی گەورەیە. خۆ کۆماری خوازێکی باش نابێ خۆی خەفەت بۆ ئەو جۆرە کەسانە بخوات)).

مادام دیفارج وتی: ((گوێ گرن، من هیچ خەمی دکتۆرم نییە. ئەو لەوانەیە سەری خۆی هەڵگرێ گۆڕی خۆی گومبکات. هەمووش هەر ئەوەیە کە بنەماڵەی ئیڤرمۆند دەبێ تێکبشکێنرێن. با ژنەکە و کچەکەش بەدوای باوکیاندا بڕۆن)).

جاکیۆسی سێیەم ئاماژەی کرد: ((ژنەکەش گەردنێکی باشی هەیە بۆ گالیۆتینە من لەوێ چاوی شینی و پرچی خەنەیی جوانم زۆر دیوە. کە سەیرت دەکردن دڵڕفێن و سەرنجراکێش بوون کە نیشانی خەڵك دەدران)).

مادام دیفارج چاوەکانی داخست و ڕۆیشت بە داڵغەدا.

جاکیۆسی سێیەم کە لە دەنگی قسەی خۆی چێژی وەردەگرت دەریخست: ((منداڵەکەیش هەر وەها، ئەویش چاوی شینە و پرچی زەردە. ئێمە بە ڕێکەوت منداڵمان لەوێ نەدیتووە. ئەبێ دیمەنێکی جوانی هەبێت)).

مادام دیفارج سەری بەرز کردەوە. هاتە سەر بڕیارێك.

((ڕاستییەکەی ئەوەیە کە من بڕوا و متمانەم بە مێردەکەم نەماوە. لەم باسەدا ناتوانم هانیبدەم. ناوێرم مێردەکەم لە ناوەڕۆکی ئەو باسە ئاگادار بکەم. چونکە لەوانەیە ئاگاداریان بکاتەوە و ئەوانیش بۆی دەرباز بن)).

جاکیۆسی سێ خۆی تووڕە کرد:))شتی وا نابێ، نابێ کەس دەرباز بێت. بە گوێرەی پێویست کەللەی سەرمان نابێت بۆ ئەم جارە. لە کۆتاییدا ئەبێ ئەم جارە بۆ ئەمرۆ سەد کەللە سەرمان هەبێت)).

مادام دیفارج درێژەی دایە: ((بە کورتی لەیەك وشەدا بیبڕینەوە. مێردەکەم وەك من باوەڕ بەو دەلیلانە ناکات کەمن هانیان دەدەم و پاڵیان دەدەم بەرەو مردن هەتا کەسیان لەو بنەماڵەیە نەمێنێتەوە منیش هیچ دەلیلێکم بە دەستەوە نییە وەك ئەو داستانی دکتۆر کۆتایی پێبێنم. بەڵام ئەبێ کارێك بۆ خۆم بکەم هەر بەو مەبەستە. وەرە هاوشاری چکۆلەی خۆم!)).

داربڕەکە ڕێزێکی زۆری لە مادام دیفارج دەگرت بۆیە لێشی دەترسا هاتە پێشەوە دەستی گرت بە تەپلە سوورەکەیەوە.

((هەر وەك سەرنجێك کە ژنەکە دەیکرد بۆ هەر کام لە زیندانییەکان. تۆ دەتوانی تەحەمولی ئەو شایەدانە بکەیت کە لەم ڕۆژانەدا دێن؟ واتە دەتوانی شایەتی بدەیت؟)).

((بەڵێ، بەدڵنیاییەوە. بۆ چی نە؟)). ئەو (داربڕەکە) هاواری کرد: ((هەموو ڕۆژێك لە هەموو شوێنێکدا. لە سەعات دووەوە تا چوار بەردەوام ئەو(لویس) لەوێ حازر بوو هەندێ جار منداڵێکی لەگەڵ بوو هەندێ جاریش بە تەنها دەهات. من بە هەر دوو چاوی خۆم دیتم)).

جاکیۆسی سێ وتی: ((هەر ئەو پیلانە نهێنییەیە. هەڵبەتە)).

مادام دیفارج پرسیاریکرد: ((باشە تۆ دڵنیایت لە ئەندامەکانیتری هەیئەتی مونسیفە؟)).

((ژنە هاوشاری خۆشەویست تۆ دەتوانی پێوەندییان پێوەبگری. خۆم دەتوانم وەڵامی ئەوانە

بدەمەوە)).

مادام دیفارج وێڕای بیر کردنەوە وتی: ((ئێستا لێمگەڕێ با بزانم ئەتوانم لەبەر مێردەکەم دکتۆری لێدەرکەم؟ من هیچ هەستێکم لە هیچ کام لە ئەو دوو ڕێیە نییە؟ ئەتوانم جیایکەمەوە؟)).

جاکیۆسی سێ هەر دەیڕوانی و چاوەڕوان بوو: ((ئەبێ ئەویش وەك سەرێك حەساب بکرێت. بە راستی خۆ سەلکە زەلامەکان کەمن تەواو نین. وادەزانم حەیفە)).

ئەو(دیفارج) درێژەی دایە:))ئەو بە تەنهایی لەگەڵ کچەکەی دەژیا کە من دەمدیت.من ناتوانم لە بارەی کەسێکەوە کە لەگەڵ ئەودا بێت قسە بکەم. نە! ئەبێ ئەوشانسی خۆی تاقیبکاتەوە. ناتوانم جیایکەمەوە. تۆ دەبێ لە سەر سەعات سێدا سەلکی هەر پەنجا و دووکەسەکە بە گالیۆتینە ببینیت. ئەبێ خۆیشم لەوێ بم. کە ئەوە تەواو بوو تۆیش لەگەڵ مندا بێیت پێکەوە دەچینە سەر شەقامی ئانتۆینە و بە دژایەتی ئەوان ئاگاداری دەدەین)).

داربڕی هەژار کە زۆر پێ خۆشحاڵ دەبێت بەو خۆشییەوە سەربەرز دەبێت کە لەگەڵ مادام دیفارجدا هاوبەش و هاوکاری بکات. ئەویش بە ساردی لایەکی لێکردەوە و هەر وەك سەگێکی پەت لە مل، ملکەچی ئیشارەتی چاوی ئەو بوو ڕۆیشتە سەر جێگەکەی.

مادام دیفارج ئەونای دیکەشی بانگکردەوە بۆ لای دەرگاکەوە لەو پیلانە ئاگاداریکردن. لویس مانێت ئێستا لەماڵەوەیە. هەر کات دەژمێری بۆ هەواڵی مەرگی مێردەکەی. لەوانەیە خەریکی شیوەن و زاری بێت. لەوانەیە لەو هەوڵەدا لە داخی دڵ، دەستبکات بەقسەی ناشیرین بە دادگای کۆمارەکە. لەوانەیە لەگەڵ دوژمنەکانی ئێمەدا هاوبیر بێت و بداتە پاڵ ئەوان. من دەچم بۆ گیانی ئەویش)).

ڤینگێنس هاواریکرد و ماچێکی کرد:))بە راستی شێرە ژنێکی! کۆمارخوازی راستەقینەی ئەی خۆشەویستەکەم!)).

مادام دیفارج درومانەکەی دایە دەستی ڤینگێنس وتی: ((درومانەکەم بۆ هەڵگرە و بیخە سەر جێگە تایبەتییەکەی خۆم. هەروەها کورسییە تایبەتییەکەم بۆ هەڵگرە، دەی بڕۆ، بڕۆ بۆ ئەو جێگەی کە خەڵکی زۆری لێ کۆ بۆتەوە)).

ڤینگێنس ماچێکی چەناگەی دیفارجی کرد و وتی: ((من بە خۆشحاڵییەوە بەگوێی

دەستووری گەورەی خۆم دەکەم. ئەی تۆ زۆرت پێ ناچێ؟)).

((من پێش ئەوەی ئەوان لەوێ بن حازر دەبم)).

ڤینگێنس هەر بە دوای ئەودا کە دەڕۆیشت بۆ ناو شەقامەکە دەی قیڕاند: ((لەوێ بێت پێش ئەوەی کە گارییەکان بێن و لەوێ حازر بن. دڵنیابە لەوێ دەبیت خۆشەویستم حەتمەن پێش هاتنی گاریەکان لەوێ بیت)).

مادام دیفارج بە نیشانەی ئەوەی کە گوێی لێبوو و لەوێش حازر دەبێت بەدەم ڕێوە، سەری بۆ دەلەقاند. پاشان دیفارج بەخێرەتەوە کشا بۆ ناو شەقامەکە. لە ناو هەموو ژنی پاریسدا، یەکێکیتر پەیدا نەبوو کە بە قەد مادام دیفارج ترسهێنەر بێت. ئەو بە ڕواڵەت بێ خەم و مەترسی بوو وادیار بوو کەسایەتییەکی جوان و سەرنجراکێش بوو بە تایبەتمەندییەکانیدا دیار بوو. ئەو بە هەستێکی قووڵی غەڵەتەوە و بەهێز و توانایی دەوڵەمەندبوونەوە گەورە بووە و خولقاوە. تەنها شتێك کە ئەو ئەسەفی بۆ ناخوات مردنە و بە هیوای مەرگیش نییە. هیچ بە لایشیەوە موهیم نییە کە پیاوێکی بێگوناح بە بۆنەی گوناحی کەسێکیترەوە بەرەو مەرگ دەڕوات. ئەوەش هەر بە لایەوە موهیم نییە کە ژنێك دەبێتە بێوە ژن و منداڵێك هەتیو دەکەوێت ئەمانە هەمووی بەس نییە بۆ ئەوە لە بەر پشتێنەکەدا لە ژێر کراسەکەیەوە دەمانچەیەکی شاردبووییەوە. چەقۆیەکی تیژیشی لە کەمەری دابوو. ئەگەرچی خۆی گورج کردبووەوە مادام دیفارج بە ناو شەقامەکەدا روویکردە ماڵی دوژمنەکانی.

لەهەمانکاتدا گارییەکەیش خەریك بوو بەرەو حەسارەکانی باکوور خۆری لێئاوا دەبوو. کە لەناو گارییەکەشدا پیرەپیاوێکی ئینگلتەرایی و دایکێکی گەنج و کیژۆڵەیەکی منداڵ و پیرەپیاوێکی فەرەنسیش کەوادیار بوو خۆی لە دەست دابوو، هەروەها پیاوێکی گەنجیش کە هەر بێ هۆش بوو.

پرسیارێك لە خاتوو پرووس و جێری کرانچێر دەبێتە هۆی نائومێدی مستر لۆری. ئەو خوازیاری لێخوڕینی گالێسکە نەبوو. بەو چراوکە کەم شەوقە هەتا ئەیتوانی بە تیژی دەڕۆیشت. جگە لەوە مسافرەکانی کەم بوون، لە حسارەکاندا تاقیکردنەوەکان کورتتر بوون. لە هەر چرکەیەکدا مەترسیی هەبوو. لە نێوان مەرگ و ژیاندا فەرقی زۆری تێدا نەبوو. ئەو بڕیاریدا کە ئەبێ خاتوو پرووس و جێری جیا جیا سەفەر بکەن. بە چرا قوتولەیەکەوە کاتێك

تاریك و لێڵ بێت گارییەك بگرن. ئەوان دەبێ دوای ئەوانیتر خێرا بڕۆن و پێوەندی بگرن پێیانەوە و بڕۆن داوای ئەسپی تر بکەون لە شارێکی تردا. بەم بۆنەوە گەلێك کات دەکەوێتە پێشترەوە.

خاتوو پرووس و جێری ویستبوویان ئەو گارییەی کە دەستی بە ڕۆیشتن کردبوو گومان دەکرا ئەو پیاوە پەشێو و بێ هۆشە کە لە ناو گارییەکەدایە بارساد بێت هێنابێتیانەوە. هەر ئەوەندە کە مادام دیفارج نزیکتر بووەوە لە ماڵەکە هەردووکیان بە پەشۆکاوییەکی گەورەوە دەستیان کرد بە وت و وێژ کە چی بڵێن و چی بکەن.

خاتوو پرووس وتی: ((مستر کرانچێر، بەلای تۆوە چاکتر نەبوو کە ئێمە لەم حەوشەدا دەستمان پێ نەکردایە؟ چونکە گاریەك پێشتر هەر لەم جێگەوە ڕۆیشتووە ئەمەی دیکەش گومانی لێدەکریت)).

جێری وتی: ((ئا دەزانم تۆ ڕاست دەکەیت خاتوو پرووس. لە هەر حاڵەتێکدا ئامادەم بۆ ڕێنوێنییەکانت)).

((من لە پەرێشانییەکی ئەوتۆدام کە بە سەختی دەتوانم بیری لێبکەمەوە. بەڵام وام پێ باشە تۆ بڕۆی بۆ ناو خەڵکەکە و گارییەکەمان بهێنی بۆ شوێنەکەی تر؟ من لەوێ چاوەڕوانتان دەبم تا ئیوە دێن و من لەوێ هەڵدەگرن)).

((ئەی چۆن بتدۆزمەوە؟)).

((لە کلێساکەی ((نۆتێردام))دا. لەم بارەوە هیچ غەڵەتێك نەکەیت. من لەوێ چاوەڕوانتان دەکەم. خێرا ڕاست بڕۆ بە گارییەکەوە لەوێ سەعات سێ حازر بیت)).

جێری حەز ناکات خاتوو پرووس بۆ خۆی لەوێ بە جێ بێڵێ. بۆیە وتی: ((بیر لە خۆت نەکەیتەوە)). وەڵامی دایەوە: ((کچەکەم! بیر لەوانی دیکەش بکەرەوە. من بێوەی دەبم، کەمتر لە ماوەی نیو سەعاتی دیکە پێکەوە لە نێو گارییەکەدا دەبین)).

هەر ئەوەندە کە جێری بەڕێ کەوت، خاتوو پرووسیش دەستیکرد بەخۆ ئامادەکردن بۆ سەفەر. گۆزەیەك ئاوی هەڵگرت بۆ ئەوەی دەم و چاوی بشوات کە لە بەر گریانی زۆر سوور هەڵگەڕابوون. ئەو نەیدەویست هیچ سەرنجێك بە لای خۆیدا ڕاکێشێ لەکاتێکدا کە بەنێو شەقامەکەدا تێپەڕی دەکرد. کە دەم و چاوی شۆرد خاتوو پرووس ملی کێشا دواوە بزانێ کەس

له نێو هۆدەکەدا نییە. بۆ خۆشی دەترسا که بـه تـەنها لـەوێ مـابووەوه. پاشـان کـه گەڕایـەوه دواوه هـاوارێکی کـرد. هاوارەکـەش لـه بـەر ئـەوه بـوو لـەناوەڕاسـتی هۆدەکـەدا زەبـەلاحێك راوەستابوو.

دەستشۆرەکه (کاسەی دەست شۆرینەکه) داکەوت و شکا و لـەت و کـوت بـوو، ئاوەکـەش باریکەی سەند و رۆیشت بۆ بەرپێی مادام دیفارج.

مادام دیفارج به ساردی سەیریکرد وتی: ((ژنەکەی ئیڤرمۆند لەکوێیه؟)).

خاتوو پرووس خێرا بیری کەوتەوه که هەموو دەرگاکانی هۆدەکان کراوەیه. یەکـەمین کـاری ئەوه بوو خێرا هەموویان ببەستێ. پاشان خۆی هەڵپەسارد به دەرگای ئەو هـۆدەدا کـه لویـسی تێدا دەحەسایەوه.

مادام دیفارج ئەوەی که ئەو ئەنجامیدا تێر سەیریکرد و بەتوڕەیی بۆی روانی که دەرگاکـانی تەواو داخست. به چاوی شڵەژاوەوه خاتوو پـرووس لایکـرد بـه لایـەوه. هـەردووکیان لـه چـەند رێیـەکی جیـاوه جیـدی بـوون بـۆخۆیـان. دڵـه خورپـێ خیرەتـی نایـه بـەر ژنـه فەرەنـسییەکه. خۆشەویستی ئێستا له دڵی ژنه ئینگلتەراییەکەدا بۆته هاندان و تەشویق کردن.

خاتوو پرووس بەبێ گرێ وتی: ((دایم وەك ژنـه شـەیتانێکی بـۆ خـۆت. تـا ئێـستا لـه مـن باشترت نەدیتوه. من ژنێکی ئینگلتەراییم)).

مادام دیفارج رێك دەیزانی که ئەم ژنه دۆستی گیانی به گیانی بنەماڵەیه خاتوو پرووسـیش دەیزانی ئەو ژنه (دیفارج) دوژمنی سەرسەختی بنەماڵەکەیه.(مانێت)

مادام دیفارج وتی: ((مـن ئەمـەوێ بـڕۆم بـۆ ئـەو شـوێنه دیـاریکراوه کـه کورسـییەکەم و درووماتەکەم لەوێدا بۆم هەڵگیراوه. هیوادارم ژنەکەی ئیڤرمۆندم چاو پێ بکەوێت)).

خاتوو پرووس وتی: ((خۆ دەزانم نیازەکەت شەیتانییە)).

هەر ژنه و به زاراوەی خۆی قسەیدەکرد و هیچکامیشیان لـه یـەکتر تێنەدەگەیـشتن. بـەڵام هەر یەك نیازی یەکتریان دەزانی چییه)).

مادام دیفارج وتی: ((من پێیدەڵێم باشتره خۆی له من نەشارێتەوه. نیشتمانپەروەرانی بـاش دەزانن ئەوه ماناى چییه. رێمبده با چـاوم پێـی بکـەوێت. بـڕۆ پێـی بڵـێ دەمـەوێ چـاوم پێـی بکەوێت. گوێت لێیه؟)).

خاتوو پرووس وتی: ((هیچ دەستووریکی تۆ بە جێ ناهێنم. تۆ ژنێکی بەدکاریت، لاوەکی)).

مادام دیفارج قیڕاندی: ((بێعەقڵی رەنگە مالۆس ( خۆگی مێ)! من خوازیاری دیتنی ئەوم. یان پێیبڵێ، یان برۆ ئەو لاوە لەرێمدا، با خۆم برۆم بۆلای)).

هەردووکیان چاویان لەیەك دەرتۆقاندبوو. مادام دیفارج هەنگاوێ: هاتە پێشەوە.

خاتوو پرووس وتی: ((من ژنێکی ئینگلتەراییم، هیچ هەقم نییە چی روو دەدات. من هەر ئەوە ئەزانم کە زۆرتر لێرەدا راتدەگرم. ئەمە گەورەترین هیواکانی خۆشەویستەکەمە. ئەگەر مەیتەکەیشم بخەیتە، دەست لەو پرچە رەشانە کە بە سەرتەوەیە بەرنادەم)).

خاتوو پرووس کەتا ئێستا لە ژیانیدا، ئەوەندە پیشی نەخواردۆتەوە. دڵی پڕ بوو لە دڵە خورپێ و دڵە راوکێ. چاوی پڕ بوو لە فرمێسك هاتنە خوارەوە. مادام دیفارجیش بە نیشانەی زەعیفی ئەو فرمێسکانەی بەچاویەوە سڕی.

پێکەنی ((ها ها. تۆ شتێکی زەعیفی، ئەوە بایی چەندی؟ من ئەو دکتۆرە بانگ دەکەم)). پاشان دەنگی بەرز کردەوە و بانگی کرد: ((دکتۆری هاوشاری! ژنەکەی ئیڤرمۆند! وەڵامم بدەنەوە یەکێکتان وەڵامم بدەنەوە. یەکێکتان بێت خۆ ئەم ژنە ئەحمەقە زیڕەی کرد. وەڵامی هاوشاری خۆتان دیفارج بدەنەوە!)).

بەڵام خۆ وەڵامێك نەبوو سەرنجێکی گومان، هات بە دیدەیدا. خێرا دەرگا بەدەرگا خۆی کرد بەژووردا و هەموو هۆدەکانی گەڕا. هەر سێ هۆدەکە چۆل بوون.

((ئەم هۆدانە بەتاڵن. ئەوان کەل و پەلیان کۆکردۆتەوە و رۆیشتوون. ئەو دەرگاکە لە پشتەوە بیکەرەوە با سەیرێکی ناو ئەو هۆدە بکەم)).

خاتوو پرووس وەڵامی دایەوە: ((شتی وا نابێت)). خۆ ئەو تێدەگەیشت. داواکارییەکەی ئەو ژنە چییە، هەروەها کە خۆی دەیزانی وەڵامی دایەوە.

((ئەگەر ئەوان رۆیشتبن. هەر ئەیانگرن و دەیانگێڕنەوە)).

خاتوو پرووس وتی: ((بەڵام هەتا ئەو کاتەی کە لێرەدایت، دڵنیا مەبە چونکە نازانیت چی بکەیت. لەوەش دڵنیا مەبە کە من بتوانم پێت بڵێم. لە هەر بارودۆخێکدا، تۆ ئەم ماڵە جێ نایەڵیت تا ئەو کاتەی من دەتوانم راتگرم)).

مادام دیفارج وتی: «یەکەم جار من دەست دەدەمە بەرنگار بوونەوە. بۆیە هیچ شتێکیش ناتوانێ بەرگری لە من بکات. ئەگەر لە بەردەم ئەو دەرگایەشدا لا نەچی لەت لەتت دەکەم».

خاتوو پرووس وتی: «ئێمە لەمماڵەدا تەنیاین. کەس ناتوانێ گوێی لە ئێمە بێت. هەر چرکەیەك کە من تۆ لێرە ماتڵکەم نرخی سەدان پۆندی هەیە بۆ لویس».

مادام دیفارج هێرشیکرد بۆ دەرگاکە. خاتوو پرووس باوەشی کرد بەکەمەریدا و بەرزی کردەوە. بێکەڵك بوو بۆ مادام دیفارج کە بەربەرەکانێ بکات لەگەڵ ئەودا بۆیە لێیدا. خاتوو پرووسیش بەو لێدانە بەهێزتر بوو. بۆیە هەر ئەو خۆشەویستییە هانیدا کە زۆرتر بەرگریبکات و لە زەوی هەڵیبرێ. دەستەکانی مادام دیفارج ئێشی پێگەیشت، دەم و چاوی ئەوی پێگوشی ئەویش(خاتوو پرووس) سەری دانەنەواند، بەڵام هەر ئەوی بە باوەشەوە بوو دای نەخستە زەوی.

خێرا مادام دیفارج دەستی لە کوتان هەڵگرت وهەستی بەدەست بردن بۆ چەقۆ کرد. خاتوو پرووسیش لەژێر لچەوە وتی: «وا لە ژێر باڵی مندا. بۆیە تۆ ناتوانی هەڵی کێشی. من لە تۆ بە هێزترم. سوپاس بۆ خوا، هەر ئاوا هەڵت دەواسم هەتا یەکێکمان ماندوو دەبین یان دەمرین».

مادام دیفارج دەستی خستە ژێر کراسەکەی. خاتوو پرووس سەری بەرز کردەوە دیتی خەریکە دەمانچە دەردەهێنێ بۆیە تێیسرەواند. لێرەدا تەقەیەك هات و یەکێك پێکرا. خاتوو پرووس بە سەر پێوە وەستابوو لە پشتییەوە لە لاتەمویەوە دووکەڵ هەڵدەستا.

کە دووکەڵ نەما وادیار بوو باشتر وایە هەڵبێت و تەرمی ئەو ژنە هەڵەشەیە بەبێگیان کەوتبوو بە سەر زەویدا بیبات و بڕوات.

بەو هەموو ترس و لەرزەوە خاتوو پرووس، مەیتەکەی هەڵگرت و تا ئەو جێگەی توانای بوو دووری خستەوە. بۆیە خێرا لە پلەکانەوە هاتە خوارەوە بۆ هاوار کردن بۆ یارمەتی. بەڵام خێرا بیری کەوتەوە کە ئەو کارە چەندە زیانی بۆخۆی هەیە. خێرا گەڕایەوە. هێزی کرد لە خۆی کە ئەو شتانەی پژابوون بەوناوەدا لایان بدات و کڵاو و شتی پێداویستی خۆی کۆ بکاتەوە. پاشان هۆدەکەی بەجێهێشت و لایەکی کردەوە و بەدوای خۆیدا. بۆ ئەوەی خۆی هێور کاتەوە ماوەیەك لە سەر پلیکانەکاندا دانیشت. پاشان هەستایە سەرپێ و بە پەلە دوور کەوتەوە حەگاڵەکەی دادایەوە بە سەر خۆیدا بۆ ئەوەی لە هەر نەیارێك خۆی حەشار بدات. لە لایەکی

دیکەوە خۆ ئەو نەیدەتوانی بێ ئەوەی کەس ئاگای لیٚبێت بەناو شەقامەکەدا تێپەڕێکات. بۆیـە هەندێ جار رادەوەستا.

بە پەلە بە ناو شەقامەکاندا تێدەپەڕی. لەچەمەکە پەڕییـە ئـەو بـەر و هاتـە نـاو کلێـسای ››نویێتر— دۆم‹‹. پاش چەند دەقەیەك چاوەڕوانی، هاتن بە خێری گارییەکەی دیت کـە جێـری لـە دەلاقەکەیەوە ملـی کێـشابووە دەرەوە. تەنانـەت پـێش ئـەوەی گارییەکـە رابوەسـتێ دەرگاکـە کرایەوە بۆئەوەی پرووس بە پەلە سـوار بێـت. بـە نیگایـەکی ئـازادەوە چـوو بـە نـاو سـەندەڵی گارییەکەدا و لە پاڵ جێریدا دانیشت.

پرووس پرسیاری لێکرد: ((هەراو هۆریا نەبوو لە ناو شەقامەکەدا؟)).

مستر کرانچیڕ بەنیگایەکی سەرسوڕهێنەرەوە خۆی نیشاندا و وەڵامی پرسیارەکەی دایـەوە: ((هەر ئەو هەراو هۆریا ئاساییە بوو)).

پرووس وتی: ((تێناگەم دەڵێی چی وتت چی؟)).

ئیتر بێ کەڵك بوو جارێکیتر دووپاتیبکاتەوە. بۆیە هەر سەرێکی بۆ لەقاند. دواتریش هـەر پرووس ئەو پرسیارەی کردەوە ئەویش هەر سەری بۆ لەقاند.

پرووس وتی: ((هیچ شتێك نابیسم)).

جێری بۆ خوی وتی: ((ئاخۆ چـی بـە سـەر هاتبێـت؟ چۆن لـە مـاوەی نیـو سـەعاتدا کـەڕ بووە؟)).

خاتوو پرووس وتـی: ((مـن هەسـتدەکەم، ئەگـەر تەقەیـەك بووبێـت ئـەوا بـەرنگار بـونیش هەبووە. ئەو تەقەیەش ئاخرین شتێك بووە کە من بە گوێی خۆم بیستم)).

جێری وتی: ((گوێبگرە. مـن گـوێم لـەدەنگـی ئـەو کارتـە ترسـێنەرانەوەیە. ئـەی تـۆ نـای بیسیت؟)).

خاتوو پرووس دەیدیت کە ئەو خەریکە بۆ ئەو قسە دەکات.

وتی: ((من هەر هیچ شتێك نابیسم)).

جێری وتی: ((باشە کە تۆ دەنگی پێکادانی ئـەو کارتانـەت نەبیـست؟ دەی ئێـستاش ئـەوا سەفەر کۆتایی پێدێت. بە رای من تۆ ئیتر هیچ شتێك لەم دنیایەدا نابیسیت)).

لە راستیدا ئەو هەر نەیدەبیست. لە بەر ئەوەی کە بۆ هەمیشە کەڕ بوو.

# - ٢٧ -

## گالیۆتینە

بە نێو شەقامەکانی پاریسدا گارییەکانی مەرگ هەر هات و چۆیان دەکرد. شەش گاری خەریکی کۆکردنەوەی خۆراکەکانی گالیۆتینە بوون. کە تایەکانی دەخولانەوە. وا گومان دەکرا کە بەنێو خەڵکدا لە نێو شەقامدا پەلە کوتێ دەکات.

بەڵام دەڵێی زۆربەی ساحێب ماڵەکان موعتادن بە سەیرکردن بۆیە لە هیچ دەلاقەیەکەوە کەس سەیری نەدەکردن. و هەندێ جاریش دەست وشك دەبوو کاتێك کە چاویان بەو هەموو سەرە دەکەوت لە ناو گالیسکەکانی مەرگدا.

لە سوار کردنی گالیسکەکاندا، هەندێ بە دەور و بەری خۆیاندا دەیانڕوانی و بە هێمنی بۆ ئاخرین کەنارەکانی شەقامەکانیان دەڕوانی. روانینەکەیان ناحەزانە بوو. هەندێ کەس ماق لە قووڵایی ناخی خۆیاندا نوقمببون. یان سەریان دانەواندبوو. هەر بێدەنگ ون دەبوون. هەندێ هەر بە هیوا بوون چۆن دەتوانن کەسانیدیکەیان چاوپێکەوێتەوە. بۆیە هەر ئاگایان لەوە بوو بە سەربەرزییەوە سەیری خەڵکەکە بکەن.

هەر گالیسکەیەك لەپاڵ گالیسکەچییەکەدا نگابانێکی هەبوو. هەندێ جار رواڵەتێك لای دەکردەوە بەلای گالیسکەچییەکە و وەك خەڵکی ناو شەقامەکە ناوی یەکێك لە زیندانییەکانی دەپرسی. یەکێك بەسەر پلیکانی کلێساکەوە چاوەڕوانی گالیسکەکان بوو کە ئەویش بارسادی جاسووس بوو. سەیرێکی یەکەم گالیسکەی کرد. ((لێرەدا نییە)). سەیری دوهەمی کرد. ((لێرە نییە)).

کە سەیری سێیەم دانەی کرد رواڵەتی رۆشن بوییەوە.

پیاوێك لە پشتیەوە وتی: ((ئیڤرمۆند کێیە؟)).

((ئەوەتە لەوێ لە پشتەوە)).

((ئەوەی کە دەستی بە دەستی کچەکانەوەیە؟)).

((بەڵێ)).

پیاوەکە قیڕاندی ((مردن بۆ ئیڤرمۆند! با بڕوات بۆ گالیۆتینە!)).

جاسووسەکە بە ترس و خەجاڵەتەوە داوای کرد: ((هۆش، هۆش!)).

((یانێ بێدەنگ بن)).

((ئەی هاوشاری. بۆ چی نە؟)).

((ئەو دەڕوات کە بەهایەك بدات. ئەو دەبێ تا پێنج دەقەی تر بە هاکە بدات. ڕێی بدەن ئاسوودە بێت)).

بەڵام پیاوەکە هەر درێژەی دا بە قیڕەکەی ((مردن بۆ ئیڤرمۆند)).

بۆ لە چرکەیەك ڕواڵەتی ئیڤرمۆند گەڕا بەلایەوە. ئیڤرمۆند جاسووسەکەی دیت کە بەپاڵیدا تێپەڕی.

سەعات بوو بە سێ. لە بەردەم گالیۆتینەدا هەندێ بە سەر کورسییەوە دانیشتبوون چەند کەسێکیان خەریکی دروومان بوون. بە سەر یەکێك لە کورسییەکانەوە ڤینگێنس دانیشتبوو رووی کردبوو بە لای دۆستەکەیەوە.

قیڕاندی: ((ترێسا! کێ ئەوی دیتووە؟ ترێسا. دیفارج!)).

یەکێك لە ژنەکان وتی: ((ئەو پێشتر قەت ون نەدەبوو)).

ڤینگێنس قیڕاندی: ((نە نابێ ئێستاش ون ببێت. ترێسا!)).

ژنێك نەسیحەتی کردن: ((بەرزتر)).

((ئەرێ، بەرزتر، ڤینگێنس زۆر بەرزتر! بەڵام خۆ ئەو دەنگت نابیسێ. ژنێکی‌تر بنێرە با گەڕێ بەدوایدا بەخوا ئەوانیش هەر نای دۆزنەوە)).

ڤینگێنس هاواریکرد: ((بەد شانس ئیڤرمۆند دەکوژرێت بەڵام ئەو لێرەدا نییە. سەیری دروومانەکەی کەن بەدەست منەوە. کورسییەکەی کە خاڵییە بۆی دانراوە، من بەشپرزی هەر هاوار دەکەم!)).

گالیسکەکان هەر خاڵی دەبنەوە و گالیۆتینەش دەستی پێکردووە. لێیدەدا! سەلکێك داکەوت و ژنە دووریێنەرەکە ژماردی ((یەك! لێدە! ژمارديان دوو!)).

ئیڤرمۆندی گومانلێکراو لە گالیسکەکە دابەزی و خەیاتەکەش دوا بەدوای ئەو

هێنرایه خوارەوە. ئەو (پیاوەکە) هەر هێشتا دەستە سارد و نەخۆشەکانی کچە خەیاتەکەی بە دەستەوە بوو. بۆیە بەئارامی خستییە پشت کچەکەوە و لەوکاتەدا کە گالیۆتینە هەر بەردەوام دەچووە سەرەوە و دەهاتە خوارەوە لە پشت ماشینەکەوە سەیری روالەتی پیاوەکەی کرد و سوپاسی کرد.

((بەلام لە بەر تۆ، غەریبەی خۆشەویستم، نابێ بێدەنگ بم، من سروشتییەکە دلم نییە و لە بواری مالیشدا فەقیرم، وا دەزانم تۆ لە بەهەشتەوە بۆ من هاتوی)).

سایدنی کارتۆنیش وتی: ((یان تۆیش بۆ من، رۆلەی خۆشەویستم چاوەکانت هەلبڕە و بە هیچ شتێکیتر بیر مەکەرەوە)).

((هەتا دەستم بەدەستەوە بێت بە هیچ شتێك یاد ناکەمەوە، ئەگەر تۆیش پەلەت بێت بە هیچ شتێکیتر بیر ناکەمەوە)).

((ئەوان بە پەلەن. تۆ نەترسی))!.

کچەکە ئەوی ماچکرد، ئەویش هەر کچەکەی ماچکردەوە. باوەشیان کرد بەیەکتردا. دەستە بچکۆلەکانی نەدەلەرزی کە ئەو بەریداو ئیجازەی رۆیشتنی دایە. لە روالەتیدا هیچ شتێك بە قەد شیرینی دەردێکی گەشبینانە پەشێو نەبووە. کچەکە رۆیشتە پێشەوە بۆ لای ئەو. ژنە دروومان بە دەستەکان ژماردیان.

((بیست و دوو)).

دەنگی چەند هاوارێك هاتە گوێ. چەند رووومەتێك لایان کردەوە. دەنگی چەند کەسێکە لە ناو خەلکەکەوە دەهات: بە تێکڕا دەستیان کرد بە تەقە.

((بیست و سێ)).

دەربارەی ئەوەوە وتیان ئەو شەوە لەو شارەدا ئەمە ئاشتی هێنەرترین روالەت بوو کە لەوێدا بینرا بوو.

ئەگەر کارتۆن خوی بە زمانی خۆی قسەی بکردایە، ئەوانیش ئەمەیان دەوت: ((من بارساد نیم. کلای، دیفارج هەروەها قازییەکانیش هێمای ئەو پیاوە زالمانە. کە پێش وەستانی گالیۆتینە دەمرن. من دەبینم لەم شوێنە پڕ مەترسییەدا شارێکی جوان و خۆش دروستدەبێت و دەبینم کە وردە وردە ئەم شەیتانە دەمرێت و دەڕوات)).

((دەزانم ئەو گیانانەی کە من خۆمیان بۆ دەکەمە قوربانی، ڕۆحی ئاشتی و بە کەڵکە و خۆشحاڵین لەو ئینگلتەرایەدا من لەوانە زیاتر نابینم. دەزانم لویس کوڕێك لە باوەش دەگرێت. کە ئەو منداڵەش پاش من ناودەنرێت. دەبینم باوکی پیر دەبێت و دەکۆمێتەوە. بەڵام باش و عاقیبەت بە خێر)).

((دەزانم لویس دەبێتە پیرەژن و لە یاد کردنەوەی ئەم بیرەوەریەدا بۆ من دەگری. من دەزانم ئەو هاوسەرەکەی کە، کاتێك کە ژیانیان کۆتایی پێدێت لە پاڵ یەکتردا رادەکشێن و لە ئاخرین جێگەی سەر زەویدا بە خۆیانەوە، خۆیان بە بەختەوەر دەزانن و ڕۆحی منیش لەناو ڕۆحی خۆیاندا دەبینن)).

دەزانم ئەو مێر منداڵانەی کە بەناوی منەوە ناو دەنرێت، گەورە دەبێت و دەبێتە پیاوێك ئێستا ئەو لەو ڕێگەوە کە ڕچەی ژیانی من بوو و ویستی من بۆ هەڵدەفڕێ و باڵ لێدەدات. دەزانم ئەو دەیباتەوە، هەروەها کە ناوی من دەبێتە نازناو بۆ ناساندنی ئەو.

دەزانم کە ئەویش کوڕێك بە قژی تەڵاییەوە دەهێنێتە ئەم شوێنە. منیش گوێم لێدەبێت کە خەریکە داستانی بە سەرهاتی منی بۆ دەگێڕێتەوە بە دەنگی خۆش.

ئەمەش دوورە، دوورە بەڵام چاکتر لەویە کە من دەیکەم. چاکتر لەوەش کە من لە ژیانمدا کردوومە. دوورە، دوور بەڵام چاکتر لەو پشوودانەی کە تا ئێستا من ناسیومە)).